# مەلای گەورە

## زاناو ئەدیب و شاعیر





عبدالخالق علاءالدین

چاپی دووەم
هەولێر ٢٠٠٩

# مەلای گەورە

## زاناو ئەدیب و شاعیر

عبد الخالق علاءالدين

چاپی دووەم

هەولێر ٢٠٠٩

بە یارمەتی سەرۆک کۆماری فیدراڵ بەڕێز جەنابی مام جەلال چاپکراوە



ئەم وینەیە بێ گیانە وەلێ ناو و نیشانی
هەر زیندوە تا چەرخی فەلەک هەیبێ گەڕانێ
بو نوسەر و زانا و شوعەرا، قەت نیە مردن
مردوو نیە هاوبیری فەلاتونی یونانی

# مەلای گەورە

مەلا محەمەدی جەلیزادە، مەلا محەمەدی حاجی مەلا عەبدوڵلا، گەر لە زۆر شوێنی کوردستان بپرسی ئەم زاتە کێیە؟ زۆربەی هەرە زۆری نایناسن. بەڵام کە گوتت (مەلای گەورە) ئیتر ئەمە هەر خۆیەتی و کەسی تر ئەم ناوەی لێ نەندراوە و بۆ نەماوەتەوە جگە لە مەلا محەمەدی جەلیزادەی کۆیە.

وا نەبی ئەم ناوە بەفرمانی سوڵتانێک پێی بەخشرابێت، خۆبشی خاوەن دەسەلات و خێڵی مەزن و بەهێز نەبوە تا لەترسان بەو ناوە بانگ بکرێت، بەڵکو مەلا و خویندەوار و خەڵک بە گشتی بەم شێوە ناویان هێناوە و روو بەڕوو پێی گوتراوە "جەنابی مەلا" ئەم ناز ناوەشی بۆ ماوەتەوە لە پاشە ملە. واتە وەکو چۆن ئیمام غەزالی لە مێژوی ئیسلامدا بە (حجة الاسلام) شورەتی دەر کردووە، جەلیزادەش دووای ٨٠٠ ساڵ بە (مەلای گەورە) لە سەرتاسەری کوردستان نێو بردراوە.

ئەم راستیە پلە و پایەی کەسایەتی و ئاستی زانستیی ئەم زانایە دەردەخا. خەڵکی کوردستان هەر توانیویانە بەم جۆرە پاداشتی بدەنەوە و هیچی تریان بۆ نەکراوە چونکە کوردستان وەکو وڵاتێکی دابەشکراو رۆژێک بەدەست فارس و رۆژێک بەدەست ئالی عوسمانەوە بووە و هەمیشە ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە ململانێ و ئاژاوەی خۆیان هاویشتۆتە نێو ئەم وڵاتە. لە ئەنجامیشدا هیچ جۆرە ئاسودەیەکی بە خۆوە نەدیتوە و هیچ دەوڵەتێکی خۆشی نەبووە تا دەزگای زانستی و رۆشنبیرییەکانی دابمەزرێنێت و هانی زاناکانی بدات بەرهەمەکانیان بڵاو ببێتەوە، دەنا ئەم کوردستانە هەر دەڵێی خاک و ئاو و هەواکەی شوێنی پێگەیشتنی زانایان و خەلکانی بلیمەت بوە. کەتەماشای مێژوی زانایان و ناو دارانی جیهانی ئیسلام دەکەی دەبینی کوردستان، وێرای بچوکی خۆی و دواکەوتنی لەڕووی ئاوەدانکردنەوە و بێ بەش کردنی لەپێشکەوتنی شارستانیەوە، دەبینی لە ریزی هەرە پێشەوەی گەلانی جیهانی ئیسلام دایە.

بەڵام بارودۆخە سیاسی و جوگرافیەکەی نالەبار بوود، دەنا یەکێکی وەک مەلای گەورە دەبایە بەلای کەمەوە ناوبانگی لە محەمەد عەبدە و سەیید رەشید رەزا کەمتر نەبایە. بۆیە مەلای گەورەش وەک رۆڵەکانی دیکەی میللەتەکەی، لەم رووەوە باجی خۆی داوە.

تا ئێستا چەندین کتێب و نامیلکە و لێکۆڵینەوە و گوتار لەسەر جەنابی مەلا نوسراوە کە زۆربەی ئەو نوسینانە لایەنی شعر و ئەدەب و کەسایەتی و باری کۆمەڵایەتی و هەڵوێستەکانی گرتۆتە خۆ. هەروەها مامۆستای پایە بەرز، کاک مەسعودی مەلای گەورە، لە هەندێک کتێب و بڵاوکراوەکانیدا باسی جەنابی مەلای باوکی دەکا. ئەوەی سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە لەسەریان نوسیوە پتر قەڵەمیان داگرتۆتە سەر لایەنی نەتەوایەتی و بیر و بۆچوونە کۆمەڵایەتیەکانی مەلای گەورە کەوا لەگەڵ هەستە نەتەوایەتیەکانیدا بایەخی تایبەتی بەکەموکوڕییە کۆمەڵایەتیەکان داوە بەمەبەستی راستکردنەوە و پرکردنەوەیان، پرۆژەشی هەبووە بۆ دوارۆژی کوردستان. هەروەها ئەم نوسەرانە لەنوسینەکانیاندا ستایشی خۆیان نیشانداوە بەرانبەر بە کەسایەتیی جەنابی مەلا کە لەبوارەکانی ژیاندا خاوەن رێبازی تایبەتی خۆی بووە. بەڵام ئەوەی دەتوانێ لەسەر مەلای گەورە بنوسێت، دوو بەشن:

١- لەرووی ژیان و هەڵوێستی مەلای گەورە وەکو مروڤێک، هەروەها لە رووی بۆچونەکانی کۆمەڵایەتی و هەڵوێستە سیاسیەکان. لەم بوارانەدا کاک مەسعود محەمەد دەتوانێ بە تیرووتەسەلی و وەکو پێویست لەسەری بنوسێت چونکە جگە لەوەی کە کوڕی ئەوە و ئاگاداریەکی تەواوی رۆژانەی لە ژیانی باوکی خۆی هەبوە و هەڵگری نهێنییەکانی بووە، خۆیشی ئیمڕۆ خاوەن قوتابخانەیەکی ئاوەدانە و لەم بوارانەدا دەتوانێ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و سەرتاسری ژیانی باوکی خۆی بنووسێت لەجیاتی ئەم پچڕ پچڕیەی کە هەندێک جار لەو کتێب و لەو نامیلکانەدا باسی لێوە دەکات. بێگومان ئەم

کاردش خزمەتێکی گەورە بە خوێندەواری کورد دەگەیێنێت.[1]

٢- سەبارەت بە ڕێبازی مەلای گەورە لە (تفسیر) و (فقه) و (اصول الفقه) و (علم الکلام) هومێدەوارم چەندین نامەی دکتۆرا لەسەری بنوسرێت یاخود نەکادیمیەکان ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆی خۆیان هەریەک لەبواری پسپۆریی خۆیدا. ئەوکات مەلایەتی و شارەزایەتیی جەنابی مەلا بۆ خەڵکانی خاوەن (اختصاص) دەردەکەوێت.

## مەلای گەورەی سیاسی

جەلیزادە لە ڕۆژانێکدا ژیاوە کە بیر و بۆچونی نەتەوایەتی و ململانێی نێوان گەلانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە جموجۆڵدا بووە. هەستی کردووە بیری توورانی خەریکە زاڵ دەبێت و ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە بەرگی ئیسلامیی بەسەر خۆدا هەڵکێشابوو وا دەبێتە دەوڵەتێکی توورانی و گەلانی تر دەکرێن بە تورک یاخود حوکمی تورکیان بەسەردا دەسەپێندرێت، بەتایبەتی کە کۆمەڵەی یەکێتی و پێشەوەچوون (جمعية الاتحاد و الترقي) لەدوای دەستوری ١٩٠٨ حوکمیان گرتە دەست و سیاسەتی تورکایەتیان یان گرتەبەر. لەو کاتەدا هەموو ئەو دروشمە بریقەدارانەی کە هەڵیان گرتبوو بەوە خورد کرایەوە کە لە وڵاتانی خەلافەتی عوسمانیدا دەبێ ڕەگەزی تورک حوکمدار و باڵادەست و خاوەن بڕیاری بێت.

لێرەدا جەنابی مەلا وەکو زانایەکی ڕۆشنبیر و پێشەوایەکی ئەم میللەتە بیری کردەوە کە کوردیش خاوەن مێژوو و زوبانە و لە یەک ناوچەی جوگرافی دایە و هەموو تایبەتمەندیەکانی نەتوایەتی خۆی هەیە و، مافی خۆیەتی داوای سەربەخۆیی بکات و لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیا ببێتەوە، بەتایبەتی کەوا بەرگە ئیسلامیەکەی بەتەواوی لەخۆی دارنی و بەرگی نەتەوایەتی توورانی

---

١- بەداخەوە کاک مەسعوود محەمەد لە ١/٤/٢٠٠٢ کۆچی دوایی کرد و ئەم ئاواتە نەهاتە دی.

بەخـۆدا هەڵکێـشـا و بوو بە دەوڵـەتی تـورکـیـا. هەر بۆیەش کـە ئینگلیـز کوردستانی گرت جەلیزادە هاوکاریی لەگەڵ کرد و بوو بە قازی لە شاری کۆیە بەو هومـێدەی کـەوا ئینگلیـز هێـزی هەرە گـەورەی جـیـهـانە و لە رۆژهەلاتی ناوەراسـتـدا پاش جـەنگی جـیـهـانیی یەکـەم خـاوەن بەرزترین دەسـەلاتە و حکومەتی دروست دەکرد و دادەنا، یارمەتی کوردیشی دەدا بۆ دروست کردنی دەوڵەتی خۆی. بەڵام مـەلای گەورە تووشی ناهومێدیەکی گەورە بوو کە دیتی وا ئینگلیز بەرامبـەر بە کـورد سـیـاسـەتێکی تری گـرتۆتە بەر و پلانی لە دژ دەگێـرێ. ئەنجامەکـەشی ئەوەبوو رێکەوتنامـەکەی (لۆزان) لەشوێن دانرا بۆیە کاردانەوەی جەنابی مەلا ئەوەندە توند بوو کە هەندێک جار لەحەد دەردەچوو. لە تەفـسـیـری قـورئانی پیـرۆزدا نموونە بەئینگلیـز دەهێنێـتـەوە بۆ هەندێک خەسڵەتی بەد وردفتاری نا هەموار. هەروەها لە هەندێک لە شیعرەکانیشی ئەم هەستە دەردەخا.

بێگومان حاجی قادری کۆیەش تەئسیری خۆی هەبووە لەسەر مەلای گەورە بەڵام تا رادەیەک دەتوانم بڵێم شیعرەکانی حاجی قادر کە جاروبار هێندێکی گەیشتۆتە کۆیە سەرنجی راکێشاوە بۆ فیکری نەتەوایەتی یاخود بڵێن هانی داوە بۆ ئەوەی ئەویش بیروبۆچوونەکـانی خۆی لە قالبی شیعر دارێژێ، کە لە ئەنجـامی هەسـتـی پڕ ئازار و چێـشـتنی سـیـاسـەتی روژانەی تۆرانییـەکـان و دواییش لە ئەنجامی سیاسـتی ئینگلیـزدا هەستی پێکردووە. دەنا وانەبێ لە نێـوان حاجی و جەلیـزادە یاخـود لەنێـوان مـەلا عـەبدوڵڵای باوکی و حـاجیـدا ئاڵوگۆڕی بیری نەتەوایەتی کرابێت. هەروەها حاجی هیچ کتێبێکی لەسەر ئەو مەسـەلەیە دانەناوە تا بگوترێ مەلای گەورە رێباز و فەلسەفەی حاجی قادری هەلبژاردووە و رێگای ئەوی گرتوە. بێگومان کە حاجی لە ئەستەنبول ژیاوە و تێکەڵ بە رۆشنبیرەکانی بووە، زووتر بەرەورووی هەلویستی تۆرانیەکان بۆتەوە کە ئەوسا تەنیـا جـموجـۆڵێک بوون و بە تەواوی پەردیان نەسـتـاندبوو. ئەم راستیە لە حاجی قادر کەم نا کاتەوە و وانەبێ بگوترێ مەلای گەورەی پێ بەرز

دەبێتەوە چونکە کارتێکردن لەنێوان قوتابخانە فەلسەفیەکاندا هەمیشە هەبوە و کارێکی ئاساییە.

مامۆستا عبدالخالق علاءالدین ماوەیەکە وەک عاشقێکی دلسۆز عەودالی کۆکردنەوەی زانیارییە لەسەر جەنابی مەلا. شیعرەکانی کۆدەکاتەوە و بەو شعرانەدا دەچێتەوە کە پێشتر بلاو کرابوونەوە کەوا هەندێکیان دەستکاری کرابوون و هێندێکیشیان وەک چۆن لە دەستخەتەکاندا نوسرابوون بلاو کرابوونەوە. ئێستاش وا مامۆستا عبدالخالق بۆ جاری دووەم لەسەر مەلای گەورە دەنوسێ کە پوختەی رەنج و کۆششی ئەو چەند سالانەی دواییەتی. خۆی ماندوو کردوە تا ئەو زانیاریانەی کۆکردۆتەوە و لەیەکی گرێداوە و هۆندوونیەوە. هەولّی داوە بەدلّنیایی بیانهاوێتە سەر کاغەز و بەهەمان شێوە دلّنیایی بداتە خوێنەر لەم شیعر و گوتارانەی لەم کتێبەدا کۆکراونەتەوە، لەهەمووی کۆلیوەتەوە و پشتی بە یەک سەرچاوە نەبەستوە، بەلّکو چوەتە لای چەندین لەو کەسانەی کە لە مەلای گەورە نێزیک بوونە و خۆشیان ویستووە و قسە و شیعر و پارچە نووسینەکانی ئەویان لەبەر کردوە یاخود نووسیویانەتەوە، مامۆستا لەگەلّیان دانیشتوە بۆ ئەوەی خۆی دلّنیا بێت لەو بەرهەمانەی جەلیزادە کەلەم کتێبەدا بلاوی کردۆتەوە. بۆیە مامۆستا عبدالخالق علاء الدین لە نووسینەکەیدا سەرکەوتوو بووە و ماندووبونەکەی بەرهەمێکی پوختی داوە. هومێدەوارم بەرهەمی پڕ بەهای تری بەدوادا بێت و زیاتر خزمەتی ئەدەبی کوردیمان بۆ بکات. بێگومان ئەم کتێبەشی دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ و زەمینەیەکی بە پیت بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ بکەونە لیکۆلینەوە و ئاشنا بوون لەسەر شەخسییەتی ئەو زانا مەزنەی کورد کە هەمیشە ئاواتی بەرز و پیرۆزی سەربەخۆبوونی کورد و بلاوبونەوەی زانست و پێشکەوتنی کوردستان بووە.

**د. فؤاد معصوم**
١٩٩٣/١٠/٦

# پێشەکی

لە بەسەرهاتی ڕۆژگار و لاپەڕی مێژوودا دەبینین بلیمەتێک یاخود سەرکردەیەکی نیشتمانی وەک ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ئاسمانی نەتەوەیەکدا سەر دەردێنێ و ئاوا دەبێ، ئەو هەڵکەوتودش هەندێک جار توانیوبەتی دەوری خۆی ببینێ و میللەتەکەی لە بارێکی نالەباری چەوساوەیی و ژێر دەستییەوە بخاتە ژیانێکی سەرفراز و ئازادەوە. لەوانیش زۆریان بە ناهومێدی سەریان ناوەتەوە وئامانجی بەرز وپیرۆزیان لەگەل خۆیانا بردۆتە ژێر خاک. ئەمرۆش یەک لەو مرۆڤە مەزنانەی کە رەوایە ئێمەی کورد ناوی لە گۆشەی مێژوی نەوەکانماندا شوێن دیار و شانازی پێوە بکەین، زانای پایە بەرز، شاعیری بەتوانای نەمر، مەلا محەمەدی کۆییە. ئەو مەلایەی کە تا دووا هەناسەی ژیانی هیچ کاتێک لە خەبات و تێکۆشان نەوەستا ، هەردەم بە هەڵبەستی نەتەوەپەرستی و هاوار و ئامۆژگاری داوای راپەڕین وهۆشیاربوونی گەلی کوردی دواکەوتووی دەکرد و دەیگوت:

**هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم**
**عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم**

مەلا محەمەدی کۆیی خاوەنی سامان و گەنجینەیەکی ئەدەبی پڕ بەهای وایە کە پێویست بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و لێدوانێکی زانستیانەی زۆر دەکات چونکە ئەو بەرهەمانەی بۆی بەجێ هێشتووین هەر هی یەک لایەنی ئەدەبی نیە. جەلیزادە وەنەبێ هەر شاعیر و نووسەر یاخود زانایەکی ئاینی بەرز بووبێت و هیچیتر نا ، دەتوانم بڵێم مەلا محەمەد پایەی رۆشنبیری و بیرفراوانی لە فەلسەفە و ئەدەب و زانیاریشدا لە (جمال الدینی ئەفغانی و محەمەد عبدە زیاتر نەبوبێ کەمتر نەبووە. تەنیا ئەوەیە کە ئەمیان لە ناو گەلێکی بەشخووراوی دوواکەوتووی هەژاردا ژیاوە و هەر وەک نەتەوەکەی حەقی خۆی نەدراوەتێ.

له ناميلكه چاپكراوەكەی پێشومدا (چاپی نەجەف سالّی ١٩٧٤) كه يەكەم پەرتووك بوو لەسەر ئەو زانا مەزنە دەرچوو، تێدا بەڵێنی دووبارە نووسینی بەشێوەیەكی فراوانتر بە خوێنەری خۆشەویستم دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا دیسان دەڵێم ئەم كتێبەشم هەموو شتێك نیە بەڵام من هەر هەندەم لەتوانادا بوو. وە لەبارەی دیوانی شیعریەوە لە هەموو شتێك زیاتر ساغ كردنەوەی هەڵبەستەكانیم مەبەست بوو چونكە ناتەواوی و دەستكاری و هەڵەیەكی زۆر لە دیوانە چاپكراوەكانیدا دێنە بەرچاو. جا لەوەشا پشتم بە دیوانە دەستخەتەكەی خوشكە نەجیبەی كچی جەلیزادە و دەستخەتێكی تری كتێبخانەی مەلای گەورە بەست وێرای پێداهاتنەوەی ماموّستا مەسعود بە دیوانەكەدا زیاتر بوو بە هۆی دڵنیا بوونمان. بە پێویستیشم نەزانی یەكە یەكە پەنجە بۆ ئەو هەلانە درێژ بكەم كە لە شیعرە چاپكراوەكانیدا هەیە، ئەوە سەرجەم و پوختەی دیوانەكەیە و لە سەرچاوە بنەرەتیەكەوە وەرمانگرت و خستمانە بەر دەستی ئێوەی بەڕێز.

دیوانی شیعری مەلای گەورە بۆ یەكەم جار لەژێر ناوی «دیاری مەلا محەمەد» دا لەلایەن خوالێخۆشبوو سەید حوسێن حوزنی موكریانییەوە لە چاپخانەی زاری كرمانجی سالّی ١٩٢٧ لە ڕواندوز چاپكراوە. بۆ جاری دووەم سالّی ١٩٤٣ لە مهاباد چاپكرا و بۆ جاری سێیەم و چوارەم لە چاپخانەی كوردستان سالّی ١٩٦٩ لە لایەن ماموّستا گیوی موكریانییەوە چاپ كراوەتەوە. با ئەوەش بڵێم كە من شیعرەكانیم زۆر بە ئەمانەت نووسیوەتەوە تەنیا ئەوەیە كە بەگوێرەی پێویست هەندێك وشە و دێرە شیعریم بۆ بەرژەوەندی دیوانەكە بە لاوە ناوە، هەروەها زۆر بەیانم گۆڕیوەتەوە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ.

حەز دەكەم ئەمەش بە خوێنەری خۆشەویست ڕابگەیێنم كە تا ئەم كتێبە بە چاپ گەیەندرا بەچەندین قۆناغی پڕ كێشە و ئەرك و نالەباری تێپەڕی. لە ڕاستیدا ئەم بەرهەمە گەلالە كردن و دەست چێنی سالّی ١٩٨٤دا، جارێ جگە

لە ڕەشنووسەکە، چووار جار سەراپا نووسراوەتەوە، هەرجارەش لەبەر هۆی تایبەتی خۆی. کەرەتێک (ڕەقابەی) بەغدا لەسەر هەندێک باس و نوسین قایل نەبوو، ناچار دووبارە پێی داهاتمەوە، راسپاردە نابەجێیەکانیم ئەنجامدا. دواتر بە هەوڵی ئەدیبێکی بەرێز ودڵسۆز، دەسگای رۆشنبیری بڕیاری لەچاپدانی دا و کۆڕی زانیاری پەسندی کرد، بە رەقابەش تێپەڕی و کەوتە گەل کاروان و زنجیرەی کتێبانی خۆشبەخت گوایە ساڵی ۱۹۸۹ دەکەوێتە بازاڕ کەچی پاش ساڵ و نیوێک مێوانداری لە رەفتەکانی دەزگای ناوبراودا فەرموویان کتێبەکەت بەردەوە پارەی چاپەمەنیمان نەما!! هەر چەندە زۆر کتێبی تریش پێشخرا و چاپکرا.

دووا بە دووای ئەوە کە نەوەی کوردمان دوچاری دەربەدەری و هاتویات و هەرای کۆڕەوە مێژوویەکە بوو، هەڵسام بەر لە هەموو سامانی دونیا وەک کۆرپەیەکی بەناز گرتمە باوەش بەرەو کەژ تەکانمان دا. ئیتر هەر مایەوە تا ئەو رۆژەی رۆشنایی و هیوای سەرفرازی کورد لە ئاسۆی کوردستان دەرکەوت و کەوتینە ئەم بار و دۆخەی ئێستای پڕ ئازادی و سەربەرزی کە هەوڵ و رەنج وئاوات وئامانجی جەلیزادەش بۆ ئەوە بوو، پەردەی ناهۆمێدی لادرا، بە چوستی کەوتمەوە پێدا هاتنەوە و خستنەوە پاڵی ئەو بابەت و نووسینانەی بەزۆر بەلاوە نرابوون. سەر لەنوێ پاک نووسم کردنەوە، سەرەڕای ئەو گیروگرفتانەی کە هاتنە پێش بەڵام با بڵێم "ماڵی گرانی چاپەمەنی بەقوڕگیرێ" چونکە کتێب چاپکردن بۆ نووسەران بۆتە خەونی شەوان. ئیتر حاڵێ ئەم کتێبە بەم شێوەیە مایەوە تا ئەم دوایە کە دەرفەت و هەڵمان بۆ رەخسا بە چاپ گەیاندرا و کەوتە بەر دەستی ئێوەی بەرێز و لە چنگ دەستی رەشی پڕ کارەساتی رۆژگار رزگاری بوو. ئیتر تکام وایە لە کەموکوڕیمان ببورن. بەمەش هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی ئەدەبی کوردم کردبێ، هەزار سلاویش لە گیانی پاکی مەلای گەورە بێت.

**عبدالخالق علاء الدين**

۱۹۹۳/۱۰/۵

# ژیانی مەلای گەورە

ناوی محەمەد کوڕی مەلا عبدوللا کوڕی مەلا ئەسعەدە. دایکی ناوی (عائیشە) یە کچی حاجی بەکر ئاغای حەویزییە لە بنەماڵەیەکی زانیاری وزانستیە کە بەدرێژایی سێ سەد ساڵ خەریکی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بوونە لە کوردستان. شاعیری نیشتمان پەروەری کورد (حاجی قادری کۆیی) لە پارچە شیعرێکدا کە لە ئەستانبوڵەوە بۆ دۆستی خۆشەویست وهاوڕێی خوێندنی (حاجی مەلا عبدوللای جەلیزادە) ی ناردووە دەڵێ:

**بە غـــەیری جـــەددی ئێـــوە کـــێـــیـــە دانا**

**لە کـــوردســـتـــان بناغـــەی عـــیلمی دانا**

ئەم بنەماڵەیە لە بنەڕەتا دەچنەوە سەر (شێخ ئیبراهیمی جەزیری) پاشان دێنە گوندی (بێگەلاس) لەناوچەی پشدەر. لەوێوە هەندێکیان هاتوونە گوندی شیواشان لە بناری خۆرهەلاتی چیای کۆسرەت. باپیرە هەرە گەورەیان کە ناوبانگی بە (مەلازادەی شیواشان) دەر کردووە، یازدە کوڕی هەبوە. کوڕی هەرە گەورەی (مەلا عەبدولا[٢]) دەچێتە گوندی جەلی و لەو ساوە ئەو بنەماڵەیە بە جەلیزادە ناو دەبرێن، ئیتر بەم چەشنە بڵاو دەبنەوە تاکو لەسەردەمی مەلا عەبدولڕەحمانی باپیرە گەورەیاندا شاری کۆیە دەکەنە مەڵبەند و لێی جێگیر دەبن.

هۆی هاتنی مەلا عەبدولڕەحمان بۆ کۆیە ئەوە دەبێ کە عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە دەوروبەری ساڵی (١٢١٠ک-١٧٩٥ز) یا (١٢١١ک-١٧٩٦ز) دێتە کۆیە و هەموو زانا و پیاوە ناودارەکان کۆ دەکاتەوە و

---

٢- مەلا عەبدوڵلا بە کاکی جەلی ناوبراوە، شایانی گوتنیشە کە نازناوی «کاکی» لە کوردستانی عیراقدا بە سێ کەس گوتراوە.
١- کاکی زێوێ ٢- کاکی هیرانێ ٣- کاکی جەلی
ئەوەش بۆ زێدە خوشەویستی و ڕێزلێنان بووە. سەبارەت بە گوندی جەلی: گوندێکی بچوکی جوانە لە قەد چیای ئاوە گردە، نزیکەی سێ سەعات بە پێ لە کۆیەوە دوورە.

ئەنجومەنێک دەبەستن. یەک لە ئامادەبووەکان مەلا (عەبدولرەحمان)ی جەلی دەبێتو لە کاتی وت و وێژدا عەبدولرەحمان پاشا بۆی دەردەکەوێ کە ئەو مەلایەی لە خوار کۆڕکە دانیشتووە زانایەکی خاوەن بەهرە و بلیمەتە. زۆر ریزی دەگرێت و دەیهێنێتە هەوراز کۆڕەکە و داوای هاتنە کۆیشی لێ دەکات، فەرمانیش دەر دەکات مزگەوتێکی بۆ دیاری بکرێت کە ئەمڕۆ بە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد ناو دەبرێ. هەروەها گوندەکانی (پێبازۆک- چنارۆک- قەسرۆک- هێزۆپ و جەلی) دەداتێ. بەم جۆرە ملا عەبدولرەحمان گوندی جەلی بەجێ دێڵێت و روو دەکاتە شاری کۆیە.

ئا لێرەدا پرسیارێک دێتەپێش داخۆ لەبەرچی عەبدولرەحمان پاشا تا ئەو رادەیە حەزی کردووە مەلا عەبدولرەحمان بێتە کۆیە و بۆچی لەم پێناوەدا ئەو هەموو خەلات و بەراتەی پێی بەخشیوە؟

وا بە بیردا دێت و مەزندەی ئەوە دەکرێت کە زۆربەی بەگ و میری ئیمارەتەکانی کورد هەوڵی ئەوەیان داوە ناودارترین زانای ئاینی بۆ لای خۆیان رابکێشن و شانازیان پێوە کردووە.

مەلا محەمەد لە ساڵی (١٢٩٣)ی کۆچی رێکەوتی (١٨٧٦) زاینی لە شاری کۆیە هاتۆتە دونیا. لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دایکی کۆچی دوایی دەکات و هەر لە منداڵییەوە زیرەکی و بلیمەتیی پێوە دیار بووە، بۆیە باوکی زۆر خۆشی ویستووە و زیاتر سەرپەرشتی پەروەردە و پێگەیاندن و خوێندنی کردووە. لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستی کردووە بە خوێندن، دەوری فەقێیەتی زوو بەسەر بردووە. لە چواردە ساڵیدا لای باوکی دەخوێنێت و لە تەمەنی هەژدەساڵیدا ئیجازەی زانستی[٣] لە باوکی وەردەگرێ، ئیتر لەوە

---

٣- ئیجازە: زاراوەیەکە بە واتای (شهادة التخرج - بروانامە) بەکار هاتوە و دراوە بەو خوێندکارانەی خوێندنی ئایینیان لە مزگەوتەکان تەواو کردووە، وە بەبونەی وەرگرتنی ئەو ئیجازەیەش شەش حەوت رۆژ لەسەر یەک شایی و زەماوەند دەکرا. گەلێک کوبوونەوە و کوری پر جوش و زۆر چەشنە یاری و گاڵتە وبەزم و سەیرانی تێدا ساز

بەدوواوە زۆربەی ئیش و کاری مەلایەتی لەجیاتی باوکی بەجێ دێنێ. توانا و زیرەکی وا بووە کە بتوانێ ئیجازەی زانستی بە هەندێک لە هاوڕێکانی خۆی بدات بەر لەوەی تەمەنی بگاتە نۆزدە ساڵ.. لە ساڵی (١٣٢٦ ک) (١٩٠٨ز) کە باوکی کۆچی دوایی دەکا نازناوی سەرۆکی زانایان (رئیس العلماء) وەردەگرێ. ئیتر لەوە بەدوواوە بە (مەلای گەرە) لە هەموو کوردستاندا ناو براوە، لە جێگای باوکی دەستی کردووە بە دەرس گوتنەوە. سبەینان تا نیوەڕۆ لە مزگەوتی گەورە، و پاش نیوەڕۆش لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی باپیری دەرسی گوتۆتەوە. لە هەموو لایەکی کوردەواری خوێندکارە ئاینیەکان روویان لە شاری کۆیە کردووە و دەرسیان لەلای ئەو خوێندووە.

گەلێک مەلای ناودار و زانای پایە بەرز لەبەر دەستی پێگەیشتوون و ئیجازەیان لێ وەرگرتووە، لەوانە: مەلا فەتحولای هەرتەل، مەلا سدیق نازەنینی، پاشان بوو بە رەئیسی مەحکەمە، مەلا مەعسووم خدر هەورامی، مەلا ئەبو بەکر، مەلا سادق ی مەلا ئەحمەد، مەلا سلێمانی ئاوماڵ، مەلا قادری کانی دەربەندی و مەلا حەمید عەسکەری ومەلا ساڵح ژێ. ئەوانە وگەلێکی دی لە مەلایانی ناودار کە ژمارەیان لە پەنجا تێپەڕ دەکات.

---

کراوە. لەلایەن خەڵکیشەوە باروبوو پێتاکیان بو کراوە حاجی مەلا عەبدولا بە بونەی ئەو روژە خوشەوە لە ئاهەنگی وەرگرتنی ئیجازەی مەلا محەمەدی کوڕی ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسی پێشکەش دەکا کە لە ساڵی (١٣١٠ ک) لە ناسرەددین شای ئێرانەوە بە دیاری بوی هاتبوو. بەڵام ئەو ئەنگوستیلە بەهادارە زۆر لای نامێنێ وون دەبێ.

# جەلیزادە و پایەی میری

مەلای گەورە لە ساڵی (١٣٣٤ ک- ١٩١٦ز) بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی (ویلایەت) لە مووسڵ وە لەلای سولەیمان نەزیف پاشا کە ئەوسا والی موسڵ بوو، پایەیەکی بەرز و رێزلێنانێکی زۆر وەردەگرێت و دەبن بە دۆست. ئەو ئاشنایەتی و قەدر و رێزەشی لەمەوە دەست پێ دەکا: پێش جەنگی یەکەمی جیهانی ئاهەنگێک دەگێڕدرێت بەبۆنەی کردنەوەی رێگای شەمەندەفەری نێوان موسڵ وحەلەب، جەلیزادەش لەوێ دەبێت لەگەڵ زاناکانی مووسڵ و کاربەدەست و پیاوانی ناودار. سولەیمان نەزیف روو دەکاتە (باش عولەمای موسڵ) (واتە سەرۆکی زانا ئاینیەکانی مووسڵ) کە وتارێک بەو بۆنەیە بخوێنێتەوە، ئەویش دەڵێ: پاشا، ئەگەر زووتر بتان فەرمووبایە ئامادەم دەکرد.. مەلای گەورەش ئاگای لێ دەبێ، روو دەکاتە والی و دەڵێ: گەر ئێوە راتان لەسەر بێ من وتارێک دەخوێنمەوە.. لەسەر فرمانی والی، جەلیزادە وتارێکی لەبار و پتەو و بە جۆش و خرۆش دەخوێنێتەوە، ئەوەش دەبێتە جێگای سەرسوڕمانی گشت ئامادە بووان بەتایبەتی سولەیمان نەزیف کە لە هەموان زیاتر پێی دڵخۆش دەبێ. دەست دەخاتە سەر شانی و دەڵێ: هەر پێداویستی و داواکاریەکت هەبێ پێم خۆشە بۆتی بە ئەنجام بێنم[٤].. مەلای گەورەش وەلامی دەداتەوە: من بۆخۆم هیچ پێویستی و کاری تایبەتیم نیە، تەنیا کۆیە زۆر بێ نەوایە، دەمانەوێ قوتابخانەیەکمان بۆ دروست بکرێ،

---

٤- ئەو رووداوەم لە میرزا حەمەدەمینی کۆیێم زانی کە بە رێکەوت ئەوسا لەگەڵ قادرە شەل لە موسڵ دەبن کاتێک دەچنە لای جەلیزادە کە لە مزگەوتی نەقشبەندی میوان دەبێ، پێیان دەڵێ: لەگەلم وەرن با نەڵێن مەلای گەورە بە تەنهایە، با وا بزانن ئێوە فەقێی منن.. ئەوانیش لە خزمەتی دەچن بو ئاهەنگەکە. میرزا دەڵێ: وتارە بە نرخەکەی مەلای گەورە لە هەموو مووسڵ دەنگی دایەوە. ئەو کۆییانەی لەو کاتەدا لە مووسڵ دەبن بو هەر چایخانەیەک چوبان پارەیان لێ وەرنەدەگرتن، دەیان گوت با لە پێناوی هاتنی مەلای گەورە و خوتبە خوش و بە نرخەکەی بێت.

ئەوەش بە نرخترین خزمەت و چاکەیە لەگەڵ ئێمەی بکەیت. ئا ئەوە بوو لەسەر خواست و داواکاری جەلیزادە فەرمان درا ساڵی (١٩١٣) یەکەم قوتابخانە[٥] بۆ کۆیە دروست بکرێت.

ئیتر لەسەر خواست و رووڵێنانی دوڵەت، ساڵی (١٩١٢ ز) مەلای گەورە بووەتە موفتیی کۆیە و دواتر لە سەردەمی ئینگلیزدا لەساڵی (١٩١٩ ز) بو بە قازی، و ساڵی (١٩٢٤ ز) لە ئەنجومەنی دامەزراندنی عیراق (المجلس التاسيس العراقي) بە ئەندام هەڵبژێردرا. سەبارەت بەمە، وا پێویستە کەمێک لەسەر ئەو ئەنجومەنە بدوێم کە مەلای گەورە تێدا ئەندام بووە چونکە کار و ئەرکەکانی بایەخێکی گرنگی مێژویی لە رووی سیاسی و باری کۆمەڵایەتی عیراق هەبووە.

ئەنجومەنی دامەزرانی عیراق لە (٨٦) ئەندام پێک هاتبوو[٦]. لە

---

٥- ئەو قوتابخانەیەش خانوێکی گەورەی دوو نهومی رێک و پێکی لە بەرد و گێچ بوو دوو سێ ساڵ دەرسی تێدا خوێندرا تا ئەوەی لە سەردەمی حوکومەتی عێراقدا ناونرا (قوتابخانەی کۆیسنجق اولی) بەش بەحاڵی خۆم دوو ساڵ خوێندنی پێنجەم و شەشەمم لەوێ تەواو کردووە. دەبێ ئەوەش بو مێژوو بڵێم کە ژمارەیەکی زۆر لە وەچەی تازە هەڵکەوتووی خوێندکاری شاری کۆیە لەو بوارەدا قەرزاری شەخسی مەلای گەورەن چونکە کردنەوەی قوتابخانە لەو بار ودوخە دوواکەوتووەی کوردەواری خوماندا بە شورشێکی کومەڵایەتی دەژمێردرا بەهۆی ئەوەوە دەرگایەکی بەرفراوانی رۆشنبیری بو خستینە سەر گازەرەی پشت سەیرکە لە شارێکی بچوکی وەکو کۆیە چەندەها زانای بەرزی ئایینی، دکتور، ماموستا، ماف پەروەر، ئەفسەر و پیاوی سیاسی، نووسەر و شاعیری بە توانای لێ پێ گەیشتن جا گەر ئەوسا بەراورد بکرێ لەچاو شارەکانی تری کوردستان بۆمان دەردەکەوێ کە چەند شارەکە لەم بارەیەوە هەنگاوی بۆ پێشەوەد ناوە.
ئەو قوتابخانەیەش کە وەک چرایەکی هەڵگیرساو لە تاریکە شەوی نەزانینی کۆیە پاش ئەوەی رولی بەرزی خوی دی ساڵێ (١٩٥٧ز) بەبەر جادە و شەقامی نوێ کەوت و روخێندرا لە شوێنەواری ئەودا کتێبخانەی گشتی) ئێستای لێ دروست کرا.

٦- ئەندامەکانی هەوێر لە ئەمانەی خوارەوە پێک هاتبوون:
١- مەلای گەورە. ٢- ئیبراهیم حەیدەری. ٣- سەبیح نەشئەت (وەزیری رێگاوبانیش

۱۹۲٤/۳/۲۷ لەلایەن شا فەیسەلی یەکەمەوە کرایەوە بە بەشداریوونی نوێنەری باڵای ئینگلیزی و سەرەک وەزیران (جعفەر عەسکەری) و وەزیرەکان و پیاوانی ناودار و میوانانی تر. ئەم ئەنجومەنە لە (۲ ئابی ۱۹۲٤) کۆتایی پێهات، واتە چوار مانگ و حوت رۆژی خایاند. لەو ماوەیەشدا کارە گرینگەکانی کە پێی سپێردرابوو تەواوی کرد، ئەوانەبوون:

۱- مۆرکردنی پەیمانی عێراقی- بەریتانی: پاش وتوو وێژ و چەند و چۆنێکی درێژ لەکۆبونەوەی (۲٤) لە رۆژی سێشەممە (۱۰ی حوزەیران) بڕیاری لەسەردرا.

۲- یاسایی بنچینەیی (القانون الاساسي) ئەمەش لەکۆبوونەوەی (٤۱) رێکەوتی (۱۹۲٤/۷/۱۰) بڕیاری لەسەر درا.

۳- یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمان (قانون انتخابات مجلس النواب) ئەمەش پاش لێکۆڵینەوە و وتو وێژ و بگرە و بردە و دەمەتەقەیەکی زۆر لە کۆبوونەوەی (٤۹) (۱۹۲٤/۸/۲) بڕیاری لەسەردرا.

دەبێ بو مێژوش بگوترێ کە مەلای گەورە کاتی ئەندامیەتی لەو ئەنجومەنەدا بەهەمو توانایەکیەوە ماف و بەرژەوەندی نەتەوایەتی کوردی دلێرانە خستۆتە بەرچاو و ئەندامێکی کارامە و دیار و لێهاتو بووە. هەندێک لە وتەکانی بە عەرەبی لە کتێبی (مذکرات المجلس التاسیسي) تۆمار کراوە کە چۆن بیروڕاکانی خۆی ئازایانە بەرانبەر کار بە دەستان دەربڕیوە. جارێک لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکەدا خۆپیشاندان و هەرایەک بەرپا دەبێ خەڵک و حەشامەتی توڕە و هەڵچوو روو دەکەنە شوێنی کوڕەکە. ئەندامەکان هەر یەک بەلایەکدا هەڵدێن خۆیان رزگاردەکەن بەڵام مەلای گەورە لە جێگاکەی خۆی ناجووڵێ و دەڵێ: هەرچیم بەسەر دێت با بە سەربەرزی بێ. ئینجا پاش بەسەرچوونی هات و بات و هەرایەکە سەرۆک وەزیران دەگەڕێتەوە دەبینێ جەلیزادە تەنیا و هێمن لە شوێنی خۆیەتی. بەسەر سوڕماوی لێی دەپرسێ: چۆن مایتەوە؟ لە وەلامدا دەڵێ: لەبەر سێ شت کە هەر یەکە بە تەنیا بەسە

---

بووە). ٤- داود بەگ حەیدەری. ٥- عەبدولا موخلیس بەگ. ٦- محەمەد شەریف بەگ. ۷- حاجی پیر داود ئاغا. ۸- حوسێن مەلا

بگەڕێوە بۆ: مجموعە مذکرات المجلس تاسیس العراقی ۱۹۲٤- الجزء الاول والثانی.

واە لێ بکا لە جێگای خۆمدا نەبزووم: یەکەم، موسلمانم، موسلمانیش دەبێ بە جەرگ و نەبەرد بێ. دووەم، من مەلام، مەلاش دەبێ لە هەموو موسلمانێک نەزاتر بێ. سێیەم، کوردم، کوردیش هەرگیز نابێ بترسێت و رابکا[٧].

هەر لە کاتی ئەندامیەتی ئەنجومەنەکەدا جارێک جەلیزادە وتارێک بە عەرەبیەکی پتەو و رەوان بەشێوەی رێزمانیەکی تەواو دەدا، چەند ئەندامێک بە تەوسەوە دەڵێن: دەڵێی سیبەویهیە.. ئەویش دەست بەجێ دووانەکەی دەکاتە تورکی، کە تەواوی دەکا پێیان دەڵێ: وام دەزانی ئێوەش وەک ئێمە زمانەکەتان لا پیرۆزە چونکە زمانی قورئانە، دەبا ئەوە سزاتان بێ کە وتارەکەم کردە تورکی.. لەوە شەرمەزاری دایان دەگرێت و داوای لێ بوردنی لێ دەکەن.

مەلای گەورە دووای ئەندامیەتی لە (ئەنجومەنی تەئسیسی) هەر بە قازیەتی مایەوە ، تا ساڵی ١٩٢٨[٨] موفەتیشێکی ئینگلیز دێتەکۆیە دەڵێن لێی نوسیووە و لەم وەزیفەیەیان دەرهێناوە، ئیتر لە وە بە دوواوە بە یەکجاری لە کارو فرمانی میری دوور کەوتیتەوە[٩].

---

٧- ئەو هەڵوێست و رووداوەم لە مەلا فەتاح عیزەتەوە زانی.

٨- لە بەڵگەنامەی دادگای کۆیە دەرکەوتووە کە مەلای گەورە لە ساڵی ١٩١٩ تا ١٩٣٠ حاکمی شەرعی کۆیە بووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لەو ماوەدا کە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزرانی عێراق بووە فەرمانی قازیەتی بە کەسی دیکە نەدراوە. ئیتر لەوە بە دوواوە هەموو کارێکی میری بەجێ هێشتووە.

٩- شایانی گوتنە کە تا ١٩١٩ فەرمانەکانی دادگاکان بە زمانی تورکی بوونە بەڵام لە ١٩١٩ تا ١٩٢٨ واتە ئەو ماوەی کە مەلای گەورە قازیی شەرع بووە لە کۆیە، تێکرای فەرمانەکانی کردووە بە کوردی هەندێ جار بە فارسی.

# خاسیەتەکانی جەلیزادە

مەلای گەورە پیاوێکی مەیلەو کەلەگەت و چوار شانەبوو، دوو چاوی گەورەی گەشی پێوە بووە، لەشی ناوەندی زۆر گۆشتن نەبوو، دەفەی سنگ و ناوچەوانی پان لوتی گەوردبوو، ریش و سمێڵەکی پڕی بەردابۆوە و روخسارێکی گەنم رەنگ و مووی خورمایی بوو. جلوبەرگ و مەندیل و عەبای باش و جوانی لەبەر کردوە و زۆر حەزی لە پاک و خاوێنی و خواردنی خۆش کردووە.

جەلیزادە پیاوێکی گران و بەرێز بووە، کەم کس توانیویەتی بەرامبەری بوەستێت و لە قسەی بداتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا خۆشەویستی هەموو لایەک بووە. دێتەوە یادم منداڵ بوین لە گۆڕەپانەکانی کۆیە خەریکی یاری کەلایانێ و تۆپانێ دەبوین، لە ناکاو یەکێک لەئێمەی رادەخوڕی دەیگوت: کوڕینە مەلای گەورە هات!!. دەست بەجێ هەموو وازمان لە یاری دەهێنا و بێ دەنگ رادەوەستاین ئەویش بە زەردە خەنەیەکی پڕ سۆزدوە تەماشای دەکردین و بە ناوماندا تێدەپەڕی. گەلێک جار سلاویشی لێ دەکردین ئنجا دەکەوتینەوە هەرا و هۆریا و بەزمی خۆمان.

جەلیزادە مرۆڤێکی بەرچاو تێر و بەخشندە، خاوەنی هەستێکی ناسک، دڵێکی میهرەبان و پڕ سۆز بووە. دڵی بە کەساس و هەژاران دەسوتا. قسە رەوان و کاریگەر، خۆش مەشرەب و دەم بە خەندە و نوکتە زان بووە. کەس لە قسە خۆشەکانی تێر نەدەبوو، دیوەخانەکەشی ببوە قوتابخانەیەکی سەربەخۆ، هەرکەس زۆر هاتوچۆی کردبایە شتی وا فێر دەبوو بگرە خوێندەواریش بوایە نەی دەتوانی بەم چەشنە شارەزایی لە ژیانی کۆمەڵایەتی پەیدا بکا. هەمیشە کۆڕ و مەجلیسی گەرم بووە، تا ئەوەی هەر کاربەدەست و دەسلاتدارێک یا کەسایەتیەکی سیاسی رووی لە کۆیە کردبایە پێشەکی سەردانی مەلای گەورەی کردووە ئەویش بە چاوی رێز تەماشای هەموانی کردووە، هەر کەسیش بە

گوێرەی خۆی لەگەڵی دوواوە.

دەنگ و ئاوازی گۆرانی کوردەواری بە تایبەتی (حەیران)ی زۆر پێ خۆش بووە. جارێک لەسەر کەپری خۆی لە چنارۆک مانگە شەو دەبێ، لە نیوە شەودا کاروانێکی کۆییان لە رانیەوە دێن بەناو رەز و باغەکاندا تێدەپەڕن. یەکێکیان بە دەنگێکی خۆش تێ هەڵدەکا لە حەیرانێ. مەلای گەورەش کە گوێی لێ دەبێ لە خۆشیان لە ناو جێگاکەی هەڵدەستێ بەددەم جگەرە کێشانەوە گوێ لە حەیرانەکە دەگرێ هەتا کاروانەکە بە هەوراز چیاکە هەڵدەگەڕێ ئاوادەبێ و دەنگ نامێنێ، بۆسبەینێ دەپرسێ ئەوە کێ بوو ئەو شەو حەیرانی دەگووت؟ پێی دەڵێن قوربان ئەوە حەمە بیژی بووە، دەڵێ: بەخوا حەیرانەکەی زۆر بەسۆز بوو ئینشاڵڵا بیژی نیە، نابێ ئەو دەنگە خۆشە هی بیژیان بێ.. رۆژێک لەگەڵ شێخ نوورەدینی[10] برای و هەندێک لە خزمان دەچنە ماڵی تاهیر چەلەبی، ئەوسا رادیۆ نەبوو بەڵکو بە (گرامەفۆن) قەوانی سەلامەی حیجازی (ڕۆمیۆ و جولێیت) لێ دەدا، ئەوەندە کاری تێ دەکا گوڕ گوڕ فرمێسکی بە چاودا دێتە خوار. شایانی گوتنیشە کە دەنگی مەلا مەعصوم[11] و شێخ محەمەد ردفعەتی قورئان خوێنی میسری پێ خۆش بووە. زۆر جار خزمەکانی گرامەفۆنیان بۆ هێناوەتە دیودخان تا گوێی لە دەنگی خاتوو (کلثوم) بێت.

---

١٠- شێخ نورەدین، برای بچوکی مەلای گەورەیە ساڵی (١٣٠٠ک ١٨٨٢ز) هاتوتە دنیا. زانەیەکی بەرزی ئاینی بووە و پاش کۆچی کاکی لە جێگای ئەودا لەسەر پێش نوێژی و خوتبە خوێندنەوە و دەرس گوتنەوە بەردەوام بووە. لە بیر و باوەڕ و هەستی نەتەوایەتی بلاو کردنەوەی زانیاری و زانستدا پەیڕەوی مەلای گەورەی کردووە و لە ڕێگای ماموستایەتی قوتابخانەوە خزمەتی نەتەوەکەی کردووە. ساڵی ١٩٥٢ کۆچی دووایی کردووە لە تەنیشت ئەودا لە گوڕستانی دەروێش خدر نێژراوە.

١١- مەلا معصوم خدر هەورامی: زانایەکی بەرزی ئاینی، یەک لە قوتابیە بلیمەت و دڵسوزە خوشەویستەکانی مەلای گەورە بووە، ئیجازەی مەلایەتیشی لەو وەرگرتووە. پیاوێکی زمان زان و بە توانا و لێهاتوو بوو، پاش شێخ نوردینی برای جەلیزادە بە ئەرکی پێش نوێژ و خوتبە خوێندنەوە و دەرس گوتنەوە هەڵساوە. لە ١٩٦٤ لە شاری کۆیە لە تەمەنی ٦٤ ساڵی کۆچی دووایی کردووە.

مەلای گەورە کەم وا بووە رقی ببێتەوە بەڵام گەر تووڕە بووایە زۆر کاری تێدەکرد و روخساری سوور هەڵدەگەڕا، بەڵام زوو دەهاتەوە سەرخۆ چونکە رق و کینی لەکەس نەبوە. هەروەها لە دیواخانی ئەودا نەدەبوایە پاش ملە بە خراپە باسی کەس بکرێت. تا بڵێی دۆست ناس و ئاشناپەروەر بوو.

شاعیری مەزنی کورد حاجی قادر لە هەست و هۆشی جەلیزادەدا جێگای تایبەتی هەبووە، مەسەلا ئەگەر قسەیەک هاتبایە پێش، گوتوبەتی: حاجی قادر وا دەفەرمێ، ئەوەش نیشانەی رێز و نەوازشت بووە. زۆر ئارەزووی خوێندنەوەی شیعرەکانی عومەر خەیام و شێخی سەعدی و حافیزی شیرازی و نووسینەکانی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ محەمەد عەبدە کردووە.

لە کۆمەڵایەتی و بواری رۆژانەدا حەزی لە نوکتە و قسەی خۆش دەکرد، گوتە خۆش و پەند ئامێزەکانی کێخوا حەوێزی شاخە پیسکەی[١٢] زۆر بە دڵ بووە دەیگوت خۆزیا ئاخاوتنەکانی هەموو بنوسرابانەوە. جارێک کێخوا حەوێز دەچێتە لای مەلای گەورە لەوکاتەدا خەریکی قورئان خوێندن دەبێ کە کێخوا گوێی لە (وعملوا الصالحات) دەبێ، بە مەلای گەورە دەڵێ "قوربان ئەم (وعملوا الصالحات)ە ئیشەکەی تێک داوە من رۆژی قیامەت هەر ئەوەندە ئومێدم هەیە کە خوا بڵێ دە بیان بەن بۆ بەهەشت لەوانەم چاکتر دەست ناکەوێت"!!.

خوا لێی خۆش بوو حوسێنی مام حەسەن کە هەر لە سەردەمی حاجی مەلا عبدولاوە ئاشنا و دڵسۆزیان بووە و لە دووا دووایەکەی ژیانیدا بۆ ماوەی ساڵێک هاودەمی شەو و رۆژی مەلای گەورە بووە، پیاوێکی نوکتە بێژ و قسە خۆش و ژیر بووە، بە رادەیەک جەلیزادە خۆشی ویستووە کە زۆر جار قسە و گوفتاری ئەوی بۆ کۆڕ و مەجلیسی خۆی گێڕاوەتەوە. تەنانەت تا ئەم

---

١٢- کێخوا حەوێز: کێخوای گوندی (شاخەپیسکە) پیاوێکی هۆشمەند و قسەخۆش و نوکتەزان بووە تا ئەوەی کە قسە خۆشەکانی لەژێر ناوی (خەمرەوێن) چاپ کراوە (١٩٧٦).

دوواییەی ژیانی بە سۆزەوە یادی مام حوسێنی کردۆتەوە وە.. لە ئاشنا دێرین و خۆشەویستەکانی تری مەلای گەورە، حاجی ئاغا مستەفا بووە کە توشی نەخۆشی ئیفلیجی دەبێت، مەلای گەورە هەموو جەژنان لەگەڵ خزم و دۆستانی چۆتە لای. دوا سەردانی کە دەچێتە لای دەبینێ وا حاجی ئاغا زۆر پەرێشانە و قسەی بۆ ناکرێت. هەردوو دەستی بۆ بلند دەکا وەک نیشانەی ماڵ ئاوایی، مەلای گەورەش دەست دەکا بە گریان، دەڵێ: ئینشاڵڵا حاجی ئاغا لە بەهەشت یەکتر دەبینینەوە.. دەست لە باوەشی یەکتر دەکەن، جەلیزادە خۆی بۆ ناگیرێت و بەجێی دێڵێ، ئیتر مەرگ دەکەوێتە پێشیان.

خەڵکی کۆیە سەراپا بە هەموو توێژ و چینەکانیەوە دەچون بۆ گوێگرتن لە وەعز و ئامۆژگاریەکانی ئێوارەی رەمەزانان چونکە جگە لە بەشە ئاینییەکەی، بەو شێوازە شیرینەی خۆی باس و بابەتی زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بەرفراوانی وای دەهێنایەوە کە لەلای زۆر لە مامۆستا و فەرمانبەر و خوێندەواران گرینگ بوون ئەگەر بە رۆژووش نەبووبان، تەنانەت هەندێک مامۆستای دیان (مەسیحی) بۆ گوێ گرتن و سوود بینین دەچوون. ئاخاوتنەکانی جەلیزادە جۆرە دەربڕینێک بووە لە هەست و ئاوات و ئامانجیان هانی دەدان کە پێویستە لە خەو راپەڕن و بێنە مەیدانی خەبات و تێکۆشان تا بگەن بە کاروانی گەلانی ئازاد و پێشکەوتوو. دەیگووت:بە یەکگرتنێکی پتەوی برایانەی هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ بە هەوڵ و کردەوەی دڵسۆزانەی بەردەوام دەتوانن نەتەوەی کوردمان لەژیانی ژێردەستی و هەژاری رزگاربکەین. رووی لە کاسبکار و کرێکاران دەکرد دەیگوت: هەموتان لای یەزدان وەک یەکن، هەقتانە بە خۆتان بنازن ئیش و کار و رەنجی پڕ سوود مایەی سەر بلندی وشانازیە. تاکو زیاتر تەکان بدەن و لە ناو کۆمەڵدا هەست بە کەم نرخی نەکەن بۆی دەگێڕانەوە کەوا جارێک حەزرەتی پێغەمبەر تووشی یەک لە هاورێیانی دەبێ، دەستی لەناو دەستی دەنێت و دەفەرمێ: بۆچی ناوپەلی دەستت زوورە؟. سەحابیەکەش لە وەلامدا دەڵێ: قوربان لەبەر کارکردن. پێغەمبەریش دەستە قارش و زوورەکەی دەگرێت و ماچی دەکات و دەفەرمێ:

ئەو دەستەی لە کارکردندا زوور دەبێ هەقە ماچ بکرێت.
خوتبە و گوتاری رۆژانی هەینی بە گوێرەی کات و پێویستی سەردەم بووە، چارەسەری کەم و کوڕی و ناتەواویەکانی کۆمەڵایەتی کردووە و هەر گوتارێک جارێکی بخوێندباوە دووبارەی نەدەکردەوە. ئێستاش هەندێک لەو خوتبە دەسخەتانەی خۆی ماون. جەلیزادە جگە لە زمانی کوردی زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی باش زانیوە. سەبارەت بە چۆنیەتی فێربوونی زمانی تورکی، رۆژێک چەند میوانێکی کاربەدەستی تورک دێنە مزگەوت، مەلای گەورەش لەوێ دەبێ بەڵام هیچ لە گفت و گۆکەیان تێناگات میوانەکان بە باوکی دەڵێن: چۆن دەبێ کوڕ کوڕی ئێوە بێ کەچی تورکی نەزانێت؟ ئیتر ئەو هەڵوێستە کاری تێ دەکا، هەست بە پێویستی فێربوونی زمانی تورکی دەکا، ئیتر بە گۆڤار و رۆژنامەوە خۆی فێرە تورکی دەکات. مەلای گەورە فەلسەفەی ژیانی خۆی بە عەرەبی لە پێشەکی کتێبەکەیدا (المصقول في علم الاصول) دەربڕیووە دەڵێ: اما مشربي وميلي فليس إلا الى الأتحاد ونبذ الخلاف ما امكن. واكرر على الدوام قوله التعالى «تلك أمة قد خلت لها ماكسبت ولكم ماكسبتم ولاتسألون عما كانوا يعملون» وقوله التعالى «ان الله لايغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم».
مەلای گەورە لە ژیانیدا دوو ژنی هێناوە. یەکەمیان نەعیمە خانی مەلا حەبیبی جەلیزادە بوو. ئەمەیان کوڕێک و کچێکی لە پاش بەجێ ما. موقتەدیر، بە گەنجی سەری نایەوە. عیفەت، کە بوو بە خێزانی شێخ حەسەنی بۆسکێن.. ژنی دووەم، حەبیب خان کچی شێخ رەزای شێخ قادری سندۆڵان بوو. دوو کوڕ و چوار کچی لێ بوو، کاک مەسعوود و فاروق، کچەکانیش بەگوێرەی تەمەن، نەجیبە خان کە ئافرەتێکی هۆشمەندی بە توانا و رۆشنبیرە، ئیقلیمە خان کە بوو بە خێزانی کاک عەلی عەبدوڵلا ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەدیبەخان کە لە ١٩٧٢ بە نەخۆشی شێرپەنجە مردوە، سورەییا خان کە بوو بە خێزانی عومەر دەبابە کە سەرکردەیەکی بەرز و تێکۆشەرێکی بزوتنەوەی کوردایەتی بوو.

# هۆی گیانی سەربەرزی و
# نەبەردی جەلیزادە

جەلیزادە پیاوێکی بە جەرگ وە رووشکێنیش بووە لەسەر هەق. ئەو تەرزە مرۆڤە بووە کە کەسی لە خۆی بەرزتر و مەزنتر نەزانیوە، سام و شەرمی لە کەس نەکردووە و زۆر بەخۆناز بووە. جا پرسیارێک دێتە پێش کە ئایا زانایەکی ئاینی لەناو ئەو هەموو ئاغا و شێخ و دەسەلاتدارانەدا کە ئەوسا جەلەوی هەمو کاروبارێک لە ژێر ئارەزووی ئەوانەوە بەرێوە دەچوو، ئایا چۆن (جەلیزادە) توانیوبەتی وا بە ئاشکرایی و نەبەردانە بێتە مەیدانی تێکۆشان و بکەوێتە گیانی هەموو زۆردارێک و دژی هەموو کارێکی نارێک؟!. ئایا ئەو گیانە شۆرشگێریەو و ئەو خەبات ئامێزەی مەلای گەورە لە چی هاتووە؟ خانەقا و تەکیەکان شان بە شانی دەسەلاتی ئاغاکان دەرۆیشت، لەگەڵ ئەوەشدا لە پێناوی بیر و رای هەقپەرستی و بەرژەوەندی میللەتی کورددا وەکو کێوێکی سەخت کەوتە پێشیان و بەرامبەریان وەستا.

بۆ وەلامی ئەو پرسیارانە ئەگەر بە ووردی سەیری باری بنەماڵەی جەلیزادە بکرێ ئەو هۆیانەی خوارەوە هەندێک هەوێنی پێکهاتنی گیانی سەربەزانەی جەلیزادە دەردەخا:

١- ژیان و گوزەرانێکی تایبەتی باشی هەبووە، واتە چاوی لە بەروبوومی کەس نەبووە وەک مەلایەکانی سەردەمی خۆی کە ژیانیان بە هۆی زکات و سەرفترە و یارمەتی خەڵکەوە بووە چونکە جەلیزادە تەنانەت لەکاتی خوێندنی فەقێیەتیش ژیانێکی پۆشتە و پەرداغ ژیاوە تا جارێک بە باوکی دەڵێی: من بەتەمای ژیانی (راتبە، رەحمتو لێ بێ) ناخوێنم. کەواتە هەبوونی ملک و زەوی و سامان هۆیەکی گرنگە کە مەلای گەورە بێباک بووبێت و لە نان بڕان نەترسێ.

٢- لە خۆرسکەوە حاجی قادر ئاسایی پیاوێکی بلیمەت و ئازاو شۆڕشگێڕ

هەڵکەوتووە، تێبوو توانا بووە، ئەوەش یاسای سروشت و ژیانەکە هەرکەسە بە جۆرێکی تایبەتی دەرسکێ.

٣- مەلای گەورە کوری حاجی مەلا عەبدوڵلایە(١٣) حاجی مەلا عەبدوڵلاش پیاوێکی زانای بێ هەمتای سەردەمی خۆی بووە نەک هەر لە کوردستانی عیراقدا بەڵکو لە ئێران و تورکیاش ناسراوە و خاوەنی خزم و کەس و کارێکی زۆر بووە، سەرەڕای ئەوەش دایکی جەلیزادە (عائیشە خان) کچی حاجی بەکراغای حەوێزیە کە لەپیاوە هەرە دەسەڵاتدارەکانی کۆیە بووە. بۆیە کەس نەیتوانیوە دەست درێژی بکاتە سەری وەک حاجی قادر و کەیفی بێ پشت و پەنا تووشی دەربەدەری و ئاوارەیی بێ.

٤- زۆر لە دانیشتوانی شاری کۆیە خاوەن زەوی و رەز و باغات بووە واتە ژێر دەستە و مل کەچی هیچ لایەک نەبووە، ئەمەش بۆتە هۆی کە بەخۆی بنازێ و گیانێکی سەر بەرزانە و ئازادی بێ. بە پێچەوانەی زۆر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان کە زەوی و زار و بەراو سەراپا هی ئاغا یا شێخ بووە، جوتیار و وەرزێر لە ترسی دەربەدەری و نان بڕان و زەوی لێ ستاندنەوە ناچار بوونە گوێدێری فەرمانی خاوەن موڵکەکان بن و نەدەبوایە سەر پێچی بکەن.

---

١٣- حاجی مەلا عەبدوڵلا، ساڵی (١٢٥٠ک-١٨٣٥ز) هاتوتە دونیا زانایەکی بەرزی ناوداری ئاینی بووە لە ئاشنا خوشەویستەکانی شاعیری نەمر حاجی قادری کۆیی بووە، پێکەوە بە فەقێیەتی گەشتێک بۆ ناوچەی باڵەکەتی دەکەن لە گوندی شێخ وەتمان لای مەلا محەمەدی کاک عەبدوڵلا دەخوێنن. حاجی قادر لە پارچە شیعرێکدا ئەودی هێناودتەوە یاد کە دەڵێ:

**بەبیــــرت دێ زەمـــــانێ چووینە باڵەک**
**بە پێـــخـاوسی نە کـەوشم بوو نە کـاڵەک**

مەلا عەبدوڵلا پیاوێکی دیارو لێهاتوو بووە لە ئێران و تورکیاش حسابیان بۆ کردووە لە بەغداش دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەڵ موفتی زەهاوی و دەروێش حەیدەری و بنماڵەی گەیلانی و سەید سەلمان پەیداکردووە لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی نامەیان لەنێواندا بووە، مەلا عبدوڵلا شاعیرێکی بەهرەداریش بووە وە ئیلهامی شیعریشی لەخۆشەویستی خاتوو «حەلیمە» کچی مەلا محەمەد وەرگرتووە.

جا دەبینین جیاوازیەکی تەواو دێتە بەرچاو لە هەست و دڵ و دەروونی بەخۆناز و گیانی سەرفیرازی و ورەبەرزیی خەڵکی کۆیە لەچاو جێگاکانی تر. بێگومان جەلیزادەش پەروەردەی خاکی کۆیە بووە و هێزێکی مەعنەوی لە شەخسیەتی پەیدا کردووە. جا ئێمە لەسەر ئەو رەوشەنە دەڵێین: گەر بهاتبایە مەلای گەورە لە شوێنیکی تری کوردستان بژیایە، ئایا هەمان پایە و شەخسیەتی دەبوو؟ وئایا خاوەن ئەو هەموو بەرهەمە زانیاریانە و ئەدەبیانە و هەڵوێستی بەجەرگی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەبوو؟ لە وەڵامدا بەبێ وەستان دەتوانم بڵێم نەخێر.

٥- جەلیزادە پایەی زانیاری لە سنوور دەرچوو بوو، هیچ سووچ و کەلێنێکی نهێنی و زانستی نەما شارەزایی لێ پەیدا نەکات، جا پیاوی تاکە زانای بێ مانەندی ناو نەتەوەکەی خۆی بێت و لەگەڵ ئەو هۆیانەی کە باسمان کردن چۆن خاوەنی ئەو مێژوە پر تێکۆشان و گیانی شۆڕشگێری و هەڵوێستی دلێرانە نابێ؟!

# هەندێک هەڵوێستی سیایی

جەلیزادە لە کاتی شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفید زادەدا چەند ئینگلیزێک دێنە کۆیە و لە ماڵی جەمیل ئاغای قایمەقام میوان دەبن. یەکیان (ئاردق قوماندانە خێلە) یان پێ دەگووت، لە دوای مەلای گەورەش دەنێرن باسی شۆڕشی شێخ مەحمود دەهێنە گۆڕێ، ئینگلیزەکان ناڕەزایی بەرامبەر شێخ مەحمود دەردەبڕن و ڕوو لە جەلیزادە دەکەن دەڵێن: تێ ناگەین شێخ لەبەر چی ئەو هەرا و ئاژاوە بە خۆڕایی بەرپا دەکات؟ مەلای گەورەش دەڵێ: ئەگەر شێخ مەحمود وڵاتی ئێوەی ژێر دەست کردبایە و تێیدا ڕەزیل بووبان ئەوەتان پێ خۆش دەبوو، ڕازی دەبوون، شۆڕشتان نەدەکرد؟ دەڵێن: بەڵێ، دەکەوابوو شێخ مەحموودی کوردیش ئەوها. ئیتر بەو وەڵامەی مەلای گەورە ئینگلیزەکان بێ دەنگ دەبن، تێ دەگەن چیان لەگەڵ پێ ناکرێ.

جارێکیتر ئینگلیزێک لە جەلیزادە دەپرسێ دەڵێ: چۆن لە حکومەتی شێخ مەحمود دەگەی؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ وەک هەموو میللەتانی جیهان کوردیش هەقی هەیە ببێتە دەوڵەت، شێخ مەحمودیش لە هەموو کەسێک لێوەشاوەترە کە ببێتە مەلیک بەڵام شوێن و سنوری کە بۆتان دیار کردووە بۆ سوپایەک ناشێ مەشق و مناوەرەی تێدا بکا!!

جارێکیتر ئینگلیزێک پێی دەڵێ تێ ناگەم تۆ لەشاری کۆیە نیشتەجێی و مەلایەکی ناو مزگەوتی، ئەو پایەو شەخسیەتەت لە کوێ بوو؟ تۆ کە هەر لە ماڵەوە دەرچویت ئێمە لە بەغداوە دەزانین بۆ کوێ دەچیت.!!

جارێک لەو جارانەی کە مەلای گەورە لە سەردەمی نیابەتیدا دیدەنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم دەکات[١٤] وتووێژیان دەکێشێتەوە بۆ باسی ئاین و زانستەکانی ئیسلامی و زمانی عەرەبی ئەو جۆرە بابەتانە. مەلیک فەیسەڵ لە

---

١٤- ڕوشنبیری نوێ ژمارە -١٠٨- ساڵی ١٩٨٥- لاپەڕە -١٩١- ماموستا مەسعود محەمەد.

قسـەکانیـدا دەردەبڕێ کە حەز دەکا لە ئاین و لە زماندا پتـر قـووڵ بێتـەوە تا ئەوەی بەم رستـەیەی عـەرەبی مـەبەسـتی خـۆی دەردەبڕێ: ارید ان استـکمل معلوماتي في الدين و في العربية عند سماحتك. ئیتـر هەر لەو دیدارەدا بڕیار دەدرێ کە بۆ ئەم مـەبەسـتە لە هاوینی داهاتودا سێ مـانگ بێتـە کۆیە. دیارە فـەرمـان دەدرێت جـێگە و رێگەیەک رێک بخـرێت کـە لە مـەلیک بووەشێتـەوە. مەلیک فەیسەڵ چەند هەزار روپیەکی نارد کە ئەو شوێنەی پێ دروست بکرێ. هات و باتی دروست کردنی مەدرەسە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد چونکە بۆ موناسەبەیەکی وەها گرنگ بوو، گەلێک لە بارستی خۆی دەنگی دەدایەوە و خەڵکی تێ دەورووکان و دروست کردنی مەدرەسەکەش لە ١٩٢٥ دەسـتی پێ کـردووە و تەواویش بوو، بەڵام مـەلیک فـەیسـەڵ لەبەر ئەرکی سیاسی و کـاروباری دەوڵەت نەیتـوانی بێت بۆ کـۆیە، زیاتریش گـیر و گرفتی (ئیستیفتـای ویلایەتی موسڵ) دەرفـەتی نەدا، ئیتـر نامەیەکی عـوزر خوازی و کـۆمـەڵـێک کـتـێبی بە دیاری بۆ مەلای گـەورە دەنێرێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەلای گەورە بە نەهاتنی مەلیک دڵگیر دەبێت.

بۆ جـاری دووەم کـاتی شـا فـەیسـەڵ لە ١٩٣٠ دێتـە هەولێـر لەبەر خـاتری مەلای گـەورە و مـەلا ئەفەندی، فـەرمـان دەدات لەسـەر شـێوەی عـەشائیـری بە دانیـشـتنەوە لەسـەر سـینی نان بخـورێ. مـەلیک فـەیسـەڵ و غـازی کـوڕی و محەمەد سەدر، مەلای گەورە و مەلا ئەفەندی[١٥] حاجی رەشید ئاغا پێکەوە

١٥- مـەلا ئەفـەندی (١٨٥٧-١٩٤٢) ناوی ئەبوبەکـر کـوڕی مـەلا عـومـەرە بە مـەلای گچکەش ناوبراوە. لەهەرە گـەورە پیـاوان و دەوڵەمـەند و دەسـەڵاتدارەکـانی ئەوسـای هەولێر بووە. زانایەکی بەرزی ئاینی و دوستێکی خوشەویستی مەلای گەورە بووە، لە شانشینی بەغداش پایەو رێز و شوێنی تایبەتی خوی هەبووە. مەلیک فەیسەڵی یەکەم چەند جارێک هاتووە لەلای ئەو میـوان بووە، هەروەها لە جموجۆڵەکانی رەشید عالی گـەیلانیـدا شـا فـەیسـەڵی دووەم و دایکی پەنا بۆ مـەلا ئەفـەندی دەبەن و لەلای ئەو دەمێنن. پیرەمێرد شیوەنی بو دەکا، سەرەتاکەی بەم شێوەیە

**ئاینی ئیـسـلام دەری خـسـتـووە**

**دووای مـردن گـیـانی وەلی زیندووە**

نان دەخۆن. مەلیک فەیسەڵ لەسەر نانخواردن دەست دەکا بە ئاخاوتن و ئامۆژگاری کردن، پێویستە وا بکەن، و ، وابکرێت و،، هتد. مەلای گەورەش ئەو هەڵکەوتەی بە هەل زانی و قسەی دەبڕێت ودەڵێ: جەنابی مەلیک ئەو قسانەی ئێوە دەیکەن ئێمەش دەیزانین، بەڵام کەس گوێمان لێ ناگرێت، جا پێی ناوێ، فەرموو با نانەکەمان بخۆین تا سارد نەبۆتەوە. ئیتر مەلیک فەیسەڵ بێ دەنگ دەبێت و دەست دەکەن بە نان خواردن.

# ڕووداوێکی تر

بەبۆنەی هاتنی مەلیک فەسەڵ بۆ هەولێر داوا لە مەلای گەورە کرا ئەویش وەکوو پیاو ماقووڵی دیکە بچێ بۆ هەولێر بەتایبەتی کە ئەو زێدە لە خەڵکی دیکە شوناسی لەگەڵ مەلیکدا هەبووە. کۆبوونەوەکە بە نیازی هاندانی دانیشتوانی کۆنە ویلایەتی موسڵ بوو کە دەنگ بەلای پچڕینەوەی ویلایەتەکە بدەن لە تورکیا بۆ ئەوەی بخرێتە سەر عێراق. مەلیک لە (باداوە) لە لای مەلا نەفەندی دادەبەزێ.

لە قەڵەبالغی پێشوازیکەراندا مەلیک لێدوانێک دەدات و تەکلیف لە مەلای گەورە دەکا قسەکانی وەرگێڕێت بۆ کوردی[١٦] وەرگێڕانەکەی مەلای گەورە بە بەتایبەتی کە قسە دەگاتە دەوری سەلاحەدینی ئەیوبی لە پاراستنی ئیسلام و رۆژهەلات شەوق و رەونەقێکی بێ ئەندازە بەو قسانە دەدات، ئەو حاڵ و بارە لەو رۆژ و هەڵکەوتەدا سەنگێکی زۆر بە هەڵوێست و شەخسیەتی مەلای گەورە دەدات. صبیح نەشئەت[١٧] کە وەزیرێکی کورد بوو دێتە لایی و پێی دەڵێ: قوربان لەم بارەدا هەرچی بفەرمووی جێ بەجێ دەکرێ، ئەم فورسەتەش هەموو جارێک ناگەڕێتەوە، چ ئارەزوویەکت هەیە مەلیک بۆتی ڕەوا دەبینێ.. مەلای گەورەش پێی دەڵێتەوە: صبیح، من لەگەڵ ئەوەدم کە ویلایەتی مووسڵ بخرێتە سەر عێراق و لە باوەڕەوە دەدوێم، رای خۆشم بە پارەی هەموو دنیا نافرۆشم، ئاخۆ دەبێ تەما و ئاردزووی چیم هەبێ؟ مەگەر لە دووا رۆژدا بەپێی هەڵکەوتی زەمانە ئەگەر موراجەعەیەکی حکومەتم کرد لەو مەسلەحەتەی کە هەمە.. وادەزانم پێویست نیە گومان بەرم بۆ ئەوەی لەم پەری دەخرێتە بەرچاو صەبیح نەشئەت چەندێکی پێ دادەگرێ کە مەلای گەورە تەکلیفێک بخاتە روو، بەڵام مەلای گەورە ناسەلمێنێ.

جەلیزادە پیاوێکی مرۆڤ پەروەر بووە، جیاوازی رەگەز پەرست نەبووە و رێزی پیاوانی ئاینی مەسیحی و جولەکەی زۆر گرتووە. جارێک بە بۆنەی

---

١٦- ئەو باس و بەسەرهاتەم لە ماموستا مەسعود محەمەد بیستوە.

١٧- هەمان سەرچاوە لاپەڕە -١٩٩- رۆشنبیری نوێ ماموستا مەسعود محەمەد.

جەژنەوە چەند دیانێک دەچنە لای مەلای گەورە، وا رێک دەکەوێ کە یەکیان دەکەوێتە هەوراز حاجیەکی دەوڵەمەندی کۆیی، حاجیەکە یەکسەر جێی دەگوازێتەوە. دواتر کە دیوەخان چۆڵ دەبێ، جەلیزادە روو لە حاجی دەکات و دەڵێ: حاجی، لەبەر چی جێگاکەی خۆت گۆری؟ چونکە کابرا دیانە و لەدیوەخانی من دانیشتوە!! هەی دوو روو، ئەدی بۆچی دوێنێ وەکو سەگ لەبەر دەرگای حاکمی سیاسی کەوتبووی؟!! چاوەڕوان بووی رێت بدەن بچیتە خزمەتی؟ ئەدی ئەو دیان نیە؟.. حاجی شەرمەزاری دای دەگرێت و خواخوای دەبێ رزگاری بێ.

ئاسۆی بیری جەلیزادە زۆر فراوان بووە، بەچاوی کات و زانست سەیری کاروباری رۆژگاری کردووە. جارێک لە کۆڕێکدا هەندێک مەلای کۆییش لە وێ دەبن، لە کاتی وتوێژ و باسی سیاسی و ئەرکی ژیانی سەردەمدا جەلیزادە روویان تێ دەکات و دەڵێ: بۆ ئەوەی لە کاروباری دنیا بگەین، فێربونی زمانی ئینگلیزی شتێکی باش و دروستە ئەمرۆ.. مەلاکان قسەکەیان بە دڵ نابێت و ناچێتە عەقلیان. بەڵام لە خۆیان رانابینن ناڕەزایی دەربڕن. هەڵدەستن دەچنە لای حەماغا[١٨] و دەڵێن مەلای گەورە قسەیەکی ناشەرعی گوتووە و چۆن دەبێ فێربونی زمانی ئینگلیزی دروست و جائیز بێ چونکە زمانی بێگانە و زمانی گاورانە و ئێمە ئامادەین لە دیوەخانی تۆ ئەمەی لەگەڵ یەکلا بکەینەوە.

رۆژی هەینی بە عادەتی خۆی مەلای گەورە دەچێتە دیوەخانی حەماغا، مەلاکانیش پێشتر لەوێ دەبن و قسەکە دەخەنە روو، جەلیزادە دەڵێ: داخۆ من گوتوومە کە فێربوونی زمانی ئینگلیزی دروستە؟ نەخێر من دەڵێم واجبە نەک دروستە.. بانگی شێخ نووری برای دەکات و دەڵێ: برۆ فلانە کتێبم بۆ بێنە.

---

١٨- حەماغا یاخود (حەماغەی گەورە) باوکی محەمەد زیاد (کاکە زیاد) کەسایەتی ناوداری کۆیە و بزووتنەوەی کوردایەتی. حەماغا گەورەی بنەماڵە غەفووریەکانی کۆیە بووە. لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو مەسعوود محەمەد کتێبێکی تایبەتی لەسەر نووسیوە بە هەمان ناو (حەماغای گەورە)- چاپی بەغدا.

کە سەیری دەکەن دەبینن رایەکەی مەلای گەورە وا لە کتێبی ئاینیشدا هەیە کەوا فێربوونی زمانی بێگانە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانانی بە (فرض الکفایة) دانراوە کە یەکێکە لە فەرمانە شەرعیەکانی ئیسلام بە واتای ئەگەر کەس نەبێ زمانی ئەو بێگانانە بیزانێت ئەوسا هەموو موسڵمانێک گوناهبار دەبێ، وەک ئەوەی کەس ئەرکی بانگ دان بەجێ نەگەیێنێت لەکاتی داهاتنی نوێژدا، ئیتر تێکڕایی خەڵکی ئەو شوێنە گوناهبار دەبن.. لێرەدا شەرمەزاری مەلاکان دادەگرێت و هەموو بێ دەنگ دەبن، حەماغاش دەڵێ: مەلاینە، وادیارە ئێوە کتێبانیش ناخوێننەوە.

لە ١٩٢٦ لیژنەیەک لە کۆمەڵەی نوێنەران (عصبة الامم) هاتن بۆ ساغ کردنەوە و پرس پێکردنی کورد داخۆ ولایەتی موسڵ بدرێتەوە تورکیا یاخود عیراق؟ بۆ ئەم مەبەستەش رای پیاوە ناودارەکانی کوردیان وەر دەگرت. مەلای گەورە لەگەڵ وەفدێک دەچێتە هەولێر، سەرۆکی لیژنە بەهۆی صەبیح نەشئەتەوە[19] لە جەلیزادە دەپرسێ: ئایا ئێوە تورکتان دەوێ یان عەرەب؟.. مەلای گەورەش لەشێوەی پرسیارەکە نارەزایی دەردەبڕێت و دەڵێ: من بەم چەشنە پرسیارەکەتان وەلام نادەمەوە.. سەرۆک لیژنەکە سەری سوڕ دەمێنێت کە ئایا چ رەخنەیەکی هەیە لە شێوەی پرسیارەکە!! جەلیزادە دەڵێ: چما کورد ژنە بە مێردی دەدەن و دەپرسن تورکتان دەوێ یان عەرەب؟.. ئەوانیش دەڵێن ئەدی پرسیارەکەت چۆن لێ بکەین؟ جەلیزادە دەڵێ: بڵێن ئایا دەتانەوێ لەگەڵ تورکان بە برایەتی لە جمهوریەتی تورکیادا یاخود بە برایەتی لەگەڵ عەرەب لە عیراقدا بژین؟ چونکە کوردیش وەکو ئەوان نەتەوە و قەومە و حەقی هەیە وەکو ئەوان لە ولاتێکدا بژین بە شێوەیەکی برایەتی نەک بە شێوەی ژن و مێردایەتی.. کە سەرۆک لیژنە گوێی لەم وتانە دەبێ داوای لێبوردنی لێ دەکات و دەڵێ: حەقتانە، رەخنەکەشتان لە جێی خۆیەتی.. جا مەلای گەورە دەڵێ: ئێمە بەرژەوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتیمان لەگەڵ برای عەرەب لە عیراقدا بە تینترە، ئێمە بە برایەتیەکی هاوتایی لەگەڵ ئەوانمان پێ خۆشترە

---

١٩- صبیح نەشئەت: وەزیری ئەشغال و ئەندامی (مەجلیسی تەئسیسی عیراق) وە خەڵکی شاری هەولێر بووە.

بژین. پاش ئەمە یەک لە ئەندامەکانی لیژنەکە گوتویەتی: هەرچەندە ئەم پیاوە شەهادەی نیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێی دەوەشێتەوە ببێتە ئەندام لە (مەحکەمەی عەدلی دوودلی) لەم بارەیەوە رای مامۆستا مەسعودی کوڕی جەلیزادە ئەمەیە: راستی رووداوەکە ئەمەیە (کۆمەڵەی نوێنەران (عصبة الامم) دانیشتنێکی چەند سعاتی بەتەنها لەگەڵ مەلای گەورەدا دادەنیشن دووای ئەو ووتووێژە سەرەتاییە مەلای گەورە زانستێکی زۆری مێژویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری دێنێتە ناو گفتوگۆکەو دەیکا بەپەراوێزو ناوەڕۆکی ئەو بیرو باوەڕانەی خۆی هەیبووە دەربارەی پرسیارەکە (ولایة الموصل) وە بەستنەوەی مافی کورد بە تورک یا عەرەبەوە ووتووەکە بۆ خۆی لای ئێمە تۆمار نەکراوە بەڵام مەعلومە دووای بەسەرچوونی ئەو دانیشتنە سەرۆکی نوێنەرانی (عصبة الامم) دەڵێ: مەلای گەورە هەرچەندە شەهادەی رەسمی نیە بەڵام لایقە ببێ بە ئەندامی مەحکەمەی عەدلی دوودلی.

## مەلیک فەیسەڵی یەکەم
## لە سەردانێکی هەولێردا پێشوازی لێ دەکرێت

ئێوارێ شارەوانیی هەولێر لە یانەی فەرمانبەران داوەتێکی گەورە لەسەر شەرەفی مەلیک دەگیرێت و مەلا ئەفەندی و مەلای گەورەش لە باداوەوە دێن بۆ هەولێر. لەبەر دەرگای نادیەکە ئۆتۆمبیلەکەی مەلا ئەفەندی و هی پارێزگاری هەولێر لەیەک کاتدا دەگەنە جێ و خەلکەکە دادەبەزن. پارێزگار سلاویان لێ دەکات و بەرەو شوێنی داوەتەکە پێشیان دەکەوێ بەڵام مەلای گەورە هەنگاو هەڵدەهێنێت و دەستی دەگرێ، پێی دەڵێ: جارێ نۆرەی ئێمەیە.. پارێزگار جوامێرانە بەسەر خۆیدا ناهێنێت و دەڵێ: مەبەستم ئەوە بووە رابەری بکەم نەبادا ئێوە شارەزای شوێنەکە نەبن.. مەلای گەورە پێی دەڵێتەوە: ئێمە شارەزاین و سوپاستان دەکەین.. ئیتر جەلیزادە و مەلا ئەفەندی لە پێشەوە و پارێزگاریش بە دووایانەوە بەرەو کومەڵەی بانگکراوان دەڕۆن.

ئەم هەڵوێستەی مەلای گەورە ئەگەر بە چاوی واقیع سەیر بکرێ، نە ئەوسا و نە ئێستاش مەلایەکی ئاینی زاتی ئەوە ناکات.

# مەلای گەورەو
# باری سیاسیی

تازە پەردە و پەروای دەوری عـوسـمـانـی پێـچـرابۆوە و ئیـمـبـڕاتۆریەتە ڕزیوەکـەی لە نێـوان دەوڵـەتە سـەرکـەوتووەکـاندا بەش کـرابـوو. باری قـورسی جەنگی یەکـەمی جیـهـانی شوێنەواری هەر مـابـوو، بێ دەرامـەتی، هەژاری و نەخۆشی و گرانی برسیـەتی و قـاتـوقـڕی، ئەوانە سـەروسـیـمـای سـەردەم بوون. شـاری کـۆیەش وەکـو زۆربەی ناوچە و شـارەکـانی تری کـوردسـتـان هێـشـتـا بە تەواوی دەسەلاتی ئینگلیزی لێ گیر نەببوو، کاسەلێس و موچەخۆر و نۆکەرانی عـوسـمـانی بە ناوی ئیـسـلامـەوە پرۆپاگەندەو چاوراویان دەکـرد و تا رادەیەک کـــاری لەســـەر بیــــروڕای خــەڵک هەبوو و لە زۆر لاوە هەرا بەرپا دەبوو و دەستدرێژی دەکرایە سەر ئینگلیزەکان. مستەر ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا (کورد و تورک و عـەرەب) لە بارەی چۆنیـەتی بار و دۆخی سـیـاسی و هۆی بەجێ هێـشتن و کـشـانەوەی لەشکریان لە نـاوچەی قـەلادزو دەربەندو رانیـە ئۆبـاڵی خسـتۆتە سەر ئەسـتۆی کـاربەدەسـتـانی خۆیان کە کەمـتـەرخەم بوونە و گـوایە توندوتیـژی و هێـزیان بەکـار نەهێناوە بەرامبـەر هەڕەشـە و دەهۆڵ کـوتانی ئوزدەمـیـر[٢٠] و تورک خـوازان، کـە بووتە هۆی پەردسـەندنی یاخی بووانی دژ بەوان بە رادەیەک کە مەترسی کەوتۆتە سەر هەمو ئۆردوگـاکـانی ئەو ناوچانە. شـایانی گوتنە کە ئەدمۆندز[٢١] بە بروسکە بۆ مەندوبی سیاسی و سـەربازیی

٢٠- ئوزدەمیر ناوی (عەلی شەفیق) بووە لە چەرکەسەکانی میسرِ بە پایەی عەقید لە سوپای عوسمانی تەقاعود کرابوو. رواندوزی کردبوو بە مەڵبەندی پروپاگەندەی تورک خوازی دژ بە بەریتـانیـا. ئەو کـابرایە هەرچەندە لە ئەستەنبوڵەوە ئەو پایە و نرخ و یارمـەتیـەی پێ نەدراوە بەلام توانی لەناو هەندێک عەشایەر و پیـاوی سـاکـاری ناو شارەکانی کوردستان لایەنگر پەیدا بکات و کاری لەسەر بیروڕایان کردبوو.

٢١- ئیـدمـوندس: دانەری کـتـێـبی (کـورد و تورک و عـەرەب)د فـەرمـانبـەرێکی گـەورەی ئینگلیــز بوو (٣٠) ســاڵ زیاتر لە عـێــراقــدا ژیانی بەســەر بردووە، لەســەردەمی

ناردووه له لاپه‌ڕه (٢٢٩) دا ده‌ڵێ:

«له‌شکری عه‌شایر له ١٧ی مانگ گوندی شاوریان داگیر کرد، به‌ره‌و رانیه‌ش دێن». سه‌نگه‌رێک له‌سه‌ر چیای ئاسۆس ١٢ سه‌ربازی سیخی تێدا بووه ده‌درێته به‌ر شه‌ستیر و ١٠ که‌سیان ده‌کوژرێن، دووده‌که‌ی تر به مه‌له له زێ ده‌په‌ڕنه‌وه و خۆیان ده‌گه‌یه‌ننه‌وه ئۆردوگاکه‌یان. به‌و جۆره ئاژاوه به ته‌واوی له‌و ناوچه‌یه‌دا ده‌ست پێ ده‌کات و جێ به ئینگلیز له‌ق ده‌بێ. به‌هه‌ر بارێک پاش بگره و برده و ئه‌رکێکی زۆر له پشده‌ر و ده‌ربه‌ند ده‌کشێنه‌وه تا ده‌گه‌نه رانیه، له‌وێش گیر نابن، به‌ناو ده‌شتی بیتوێن به‌ره‌و کۆیه ده‌که‌ونه رێ»... هتد.

ئه‌دمۆندز به درێژی باسی شپرزه‌یی و ماندویی له‌شکره‌که‌یان ده‌کات که چۆن تووشی قوڕ و زه‌نه‌کی ئاوی برنجی بیتوێن بوونه، هه‌موو تۆپی قورس و تفاق و باری ئێستریان ده‌چه‌قێ، ناچار به‌جێی دێڵن به هه‌ر جۆرێک بێت به خۆیان و چه‌کی سوکیانه‌وه ده‌گه‌نه گوندی (سه‌رخمه). به گوێره‌ی که ئه‌دمۆنز ده‌ڵێ: سواراغا پیاوێکی داناو دووربین بوو خۆی تێکه‌ڵ به گێچه‌ڵی له‌شکری تورک خوازان نه‌کرد، ده‌نا مه‌گه‌ر خوا بزانێ له چه‌نگ هۆزی پیران چیمان به‌سه‌ر ده‌هات[٢٢].. هه‌روه‌ها له لاپه‌ڕه ٢٣٣ ده‌ڵێ: پاش دڵنیابوونم له چاو پێکه‌وتنه‌که‌ی (سواراغا) گه‌ڕامه‌وه گوندی (بوریش) دوو سه‌عاتێک پێش کاتی جووڵه‌مان هه‌وڵم دا هه‌ندێک بنووم. که خووده‌که‌ی سه‌رم داکه‌ند، دیتم لای راستی خووده‌که دوو کونی بچوکی له‌ته‌نیشت یه‌کتری تێدایه که‌وا له‌گه‌ڵ

---

قوتابییه‌تی له به‌ریتانیاوه فارسی فێر بووه، زمانی کوردی به هه‌موو شێوه و زاراوه‌کانیه‌وه زۆر باش زانیوه، له عه‌ره‌بیش شاره‌زا بوو، وه یه‌ک له سیاسییه به‌رزه ناوداره‌کانی ئینگلیز ده‌ژمێردرێ له سه‌رده‌می (پاشایه‌تیدا) را سیاسییه‌کانی ئه‌و به هه‌ند وه‌رگیراوه و گوێ دێری بووین.

٢٢- سواراغا: کوڕی محه‌مه‌د ئاغای پیرانه، پیاوێکی ئازاو به جه‌رگ و نانبده‌و لێوه‌شاوه بوو کابتان های له کتێبه‌که‌یدا (سنتان فی کردستان) به درێژی باسی روخسار و شه‌خسیه‌تی کردووه، له‌گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌ی غه‌فوری و حه‌وێزیان به هوی ژنانه‌وه تێکه‌ڵاوی په‌یدا کردووه، له (١٩٤٦) له ته‌مه‌نی (٦٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووه.

کاسەی سەرم یەک چارەکە ئینجی بەین بوو. ئینجا هاتەوە بیرم کە لە بەینی (بۆسکێن) و گۆماوەکەدا هەستم بە لەرینەوەیەکی سوک کرد خوودەکە بەلای چاوی چەپی دادام. لەرێکەوتی باشەوەیە هەرچەندە بە رۆژ ماندوو بم، شەو توانای نووستنم هەر هەیە و خەوم لێ هەڵناکرێ، بەڵام ئەو شەوە لە خەو راپەریم وام هاتە بەرگوێ کە دەنگی تۆپ و رەشاش دێت (پۆپ، پۆپ، پۆپ) کە سەیرم کرد ئەوە پرخە پرخی ئەو تاکە سەربازە تورکە دیلەمان بوو بە جلی سەربازیەوە نووستبوو.. پاشان ئەدمۆندز دەڵێ: نیوەڕۆی رۆژی داهاتوو فەرمان هات کە سیخەکان بۆ هەولێر و (لێڤی)ش بۆ کەرکووک بکشێنینەوە. ئەو بارە لە تێشکانێکی نالەبار دەچوو و شوێنی ئینگلیزەکانی خستە مەترسیەوە. ئەو شەوە لەگەڵ لێڤیەکان چووم تا گەیشتینە تەقتەق پێش بەرەبەیان لە زێ پەرینەوە. ئەو رۆژە لە رێدار[٢٣] لەبەر گەرما ماینەوە، پاشان کەوتینەوە شەورێ. لە ٤ی ئەیلوول گەیشتینە کەرکوک، ئەو ماوەمان هەمووی بە شەوی مانگەشەوی رووناک بڕی[٢٤].

هەر لەم بارەیەوە کاک عەبد جاسم[٢٥] دەڵێ: کە ئینگلیزەکان بەخۆیان و (٧٥) برینداروە بە شپرزەیی لە دەشتی بیتوێن گەیشتنە کۆیە، لە بەرەبەیاندا

---

٢٣- رێدار: لە ناوچەی شوان، کەوتوتە نێوان تەقتەق و کەرکوک.

٢٤- عبدالمنعم: لە کتێبەکەیدا (ثورتنا في الشمال) دەڵێ: کوژراوانی ئینگلیز لەو شەڕانەدا (١٥٠ هەتا ٢٠٠) کەس و بریندارییان (١٠٠) بوە بەڵام ئەدمۆندز باسی بریندار و کوژراوی لەشکرەکەیانی نەکردووە.

٢٥- عبد جاسم کوڕی محەمەد ئەمین حاجی یاسینە. ساڵی ١٩٠٢ لە شاری کۆیە هاتوتە دنیا و لە بنچینەدا لە تکریتەوە لە سەردەمی باپیریەوە ساڵی (١٨٣٥) دێتە کۆیە بو مەبەستی رێک کەوتن لەگەڵ بازرگانەکان بو گواستنەوەی تووتن و شتومەکی تر بە کەڵەک بە رێگای تەقتەق بو بەغدا، یەکەم رێک کەوتنی لەگەڵ سەعید بەگ دەبێ کە لە نەوەی پاشای کورەیە و لە رواندزەوە هاتبوو ولە کۆیە و نیشتەجێ ببوو. عەبد جاسم پیاوێکی زمانزان و هوشمەند و نوکتەبێژ و خۆش مەشرب بوو. ئاگادارییەکی زوری دەربارەی رووداو و بەسەرهاتی مێژوویی بەتایبەتی ناوچەی کۆیە دەوروبەری هەبوو لە ١٩٩٢ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

یەکسەر دەرگەی مزگەوتەکانیان گرت، هەرکەس بۆ نوێژکردن چووبایە ئەوا راپێچەکیان دەدا و هەر چوار کەس دەبایە بریندارێک هلگرن بەرەو تەقتەق ملی رێگایان پێ دەگرتن. سەیر لەوەدا بوو زۆریان بێ پشدێن و بە سینگی بەرەلا، هەندێکیشیان بە سەری رووت تووشی ئەو بێگارییە بوون. بە هەر حاڵ، پاش ئەرک و دەردەسەری دەگەنە جێ، ئەوسا (مدیر ناحیة) عەولا ئاغای حەوێزی بوو، حەزی لە چارەی ئینگلیزەکان نەدەکرد. من لەگەڵی ریک کەوتم (کەلەک) یان بۆ هەڵبەستم بیانبەم بۆ شارۆچکەی پردێ. داوای هەزار روپیەش بکەم، عەولا ئاغاش لای ئەوان خۆی تورە بکات و بڵێ: ئەوانە لێقەوماون دەبێ بە ٧٥٠ روپیە هەڵیان بگرم.. بەم چەشنە ئینگلیزەکان بە سواری کەلەک بەرێکەوتن، هێزێکی چەکداریشیان لەمبەرو ئەوبەری رووبارەکە بۆ پاراستنیان کەوتە رێ و هەموویان لە هەمان رۆژدا گەیشتنە پردێ، تەنیا بریندارێکیان لە رێگا لێ مرد.

ئیتر بەم جۆرە لەدەورو بەری ساڵی ١٩٢٢ ئینگلیزەکان لەناوچەی پشدەر و بیتوێن هەلاتن هاتنە کۆیە لەوێش گیر نەبوون. کۆیە بەبێ دەسەلاتی میری مایەوە، لەبەر ئەوەش پیاوە دەسەلاتدارەکانی کۆیە ئەنجومەنێکیان بەست، مەلای گەورەیان کردە سەرۆک ئەنجومەنی هەڵسوراندنی کاروباری ناوچەی کۆیە، واتە وەک حکومەتێکی کاتی لێ هات و ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە لە بنەماڵەی حەوێزیان ئەمانە بوون: جەمیل ئاغا، عەبدوڵا ئاغا، کەریم ئاغا. وە لە بنەماڵەی غەفوریان: ئەحمەد ئاغای سمایل ئاغا، رەسول ئاغا. کاروباری شارەکە لەلایەن ئەو ئەنجومەنەوە بە سەرۆکایەتی مەلای گەرە بەرێوە دەچوو هەتا تورکەکان بە سەرکردایەتی (رەمزی) ناوێک بە خۆی و (٢٥) سەرباز هاتنە کۆیە و رەمزی بوو بە قایمقام. شایانی گوتنیشە کە لەم بارەیەوە مامۆستا مەسعود دەڵێ: بۆ خزمەتی مێژوو دەبێ ئەوەندەش بگوترێ کە مەلای گەورە خۆی دەیگوت کە لەو رۆژانەی حکومەتی کاتیدا کە سەرۆکایەتی بەو سپێردرابوو، هەرچەندە ئەندامانی حکومەت لێیان داوا دەکرد لەسەر ئیمزاکەی

(رەئیسی حکومەت) بنوسێ، ئەو بە عادەتی هەمیشەیی خۆی هەر دەینوسێ (جەلیزادە) و ئەو لەقەبەی (رەئیسی حکومەت)ی بە کار نەهێنا چونکە دەیزانی کارەکە سەر ناگرێت و کۆیە ناتوانێ خۆیسەپێنێ وەک دەسەلاتێکی بەردەوام.

ئینگلیزەکان بە هاتنی تورکەکان بۆ کۆیە ناڕەحەت بوون، شارەکەش تووشی شڵەژان و ناڵەباری هات. جەلیزادە بە هاتنی تورکەکان و بە شێوانی باری کۆمەڵایەتی زۆر دڵگیر بوو، بەخۆی و ماڵ و منداڵیەوە چووە گوندی پێبازۆک[٢٦] کاتێک تورکەکان لە کۆیە دەرکران لەسەر تکاکاریی خزم و دانیشتوانی شار هاتەوە کۆیە.. سەبارەت بە چۆنیەتی هاتنی تورکەکان و ئاڵۆز بوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی شاری کۆیە بەم شێوەیەبوو: مەلا حەوێز ئاغای غەفوری بە خۆی و ٣٠ سوارێکەوە بۆ هێنانەوەی تورکەکان دەچێتە رانیە. کەریم ئاغای حەوێزیش لەگەڵ تاقمی خۆی تا گوندی (سەرخمە) دەچن، لەرێدا تووشی تورکەکان دەبن و پێکەوە بەرێی چنارۆک بەرەو کۆیە دێن. لە کۆیەوەش عەبدولا ئاغا بەرگە پاشایەکەی لەبەر دەکات و دێتە سەر ریگایان، بەیداغیان لە پێش هەڵگرتبوو کە دینی ئیسلام تازە بۆتەوە. تورکەکان بە هەمویان ٧٥ کەس بوون بەڵام زۆر شڕ و پەرێشان بوون، هەرچی دەیپرسی کوانی لەشکری خەلیفەی ئیسلام؟ دەیانگوت وا لە دوواوەیە!!

رەمزی بەگ ناوێکیان لەگەڵ دەبێ خۆی دەکاتە قایمقام و سەرکردایەتی سوپایش دەداتە دەست (ناجی ئەفەندی) (ملازم سانییێکی). ئیدی کۆیییەکان کە بە ئومێدی شتێک بوون ئەنگوستی پەشیمانی دەگەزن، تورکەکان سەر لەنوێ هەندێک دام و دەزگای تازە دادەمەزرێنن، چەند فەرمانبەرێک کە لە خۆیان دەترسان پێش ئەوەی تورکەکان بێن بە رێی ئاخورە[٢٧] و هەڵەجە خۆیان

---

٢٦- پێبازوک: گوندێکی پڕ کشتوکاڵ و ئاوەدانە کەوتوتە رۆژهەڵاتی کۆیە.

٢٧- مێژووی کۆیە ماموستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی.

دەرباز کرد. ئینجا ئینگلیزەکان بە فڕۆکە بەیاننامەیان بەسەر کۆیە فڕێدا کە ئەگەر تا سێ ڕۆژی تر تورکەکان لە کۆیە دەرنەکەن شارەکە بۆمباردمان دەکەین. ئیتر کە تورکەکان نەڕۆیشتن ئینگلیز لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ فڕۆکەیان نارده سەر کۆیە و نزیکەی ٧ ڕۆژ بۆمباردمان کرا. فەقێ تاهیر کوڕی کێخوا عەلی دۆڵەسزەیی کە لە تەمەنی ١٢ ساڵان بوو کوژرا و فەقێیەکیشی بریندار کرا. ئێوە بزانن لە ماوەی چوار ساڵدا کۆیە و وڵاتەکەی چ ڕووداوێکی گرنگی دیتوە؟! ڕۆژێک تورک و ڕۆژێک ئینگلیز، دووبارە تورک، جا دووبارە هاتنەوەی ئینگلیز. لەم کەین و بەینەدا گەلێ کۆیێ سەر و ماڵیان تێدا چوو.

# مەلای گەورەو
# باری کۆمەڵایەتی کۆیە

تا زیاتر ئەرک و دەوری زانا و نیشتیمان پەروەرێکی وەک جەلیزادەمان بۆ دەرکەوێت، پێویست بەچاوپێخشاندنێکی سەرپێی بە باری ئەوسادا بخشێنین و کورتە مێژویەکی بنەماڵە و دەسەلاتدار و ناودارانی کۆیە دەکات. هەر کە باسی رابردووی شاری کۆیە بێتە پێش یەکسەر ناوی دوو بنە ماڵەی دەست رۆیشتوو دەبیسین: یەکەم: بنەماڵەی حەوێزی، دووەم: بنەماڵەی غەفوری.

دەتوانین بڵێین کاروباری شارەکە و باری کۆمەڵایەتیی نێو شارەکە بە گوێرەی کۆچە و گەڕەک سەر بە و دوو بنەماڵە بووە و کارێکی زۆریان لەسەر مێژووی کۆیە هەبووە. و هەردوو لایان لەبەر هەندێک هۆی ئابووری و موڵک و سامان و دەسەلاتداریەتی هەمیشە جۆرێک رکابەری و ناحەزی لە نێوانیاندا هەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە درێژایی رۆژگار ئەو ناکۆکی و ناحەزیە نەگێیشتۆتە رادەی خوێنرشتن و کوشتن، وە بەهۆی ژن و ژنخوازی خزمایەتیشیان لە نێواندا پەیدابووە.

## بنەماڵەی حەوێزی

رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر پیاوێکی هەڵکەوتە، ناوی (حەوێز ئاغا) دەبێ، ئەو حەوێز ئاغایەش باپیری حاجی بەکر ئاغای ناودارە. حەوێز ئاغا دوو کوری هەبوود، محەمەد ئاغا و مەعروف ئاغا. پاش مردنی حەوێز ئاغا محەمەد ئاغای کوری لەجێگای دادەنیشێ، دووای ئەویش مەعروف ئاغای برای جێگەی دەگرێتەوە. وا رێک دەکەوێت کە نەخۆشیی رشانەوە لە شارەکە بڵاو دەبێتەوە، مەعروف ئاغا و زۆربەی خزمەکانی لەناودەچن تەنیا حاجی بەکر ئاغای کوری محەمەد ئاغا دەمێنێ. هەموو موڵک و سامانی بنەماڵەکە بۆ ئەو دەمێنێتەوە[٢٨] حاجی بەکریش پیاوێکی لێودشاوەی ئەدەب دۆست و

---

٢٨- ئەم زانیاریە لە روستەم عبدالفتاح ی شاعیرەوە زانی.

شاعیر بووه. ساڵی ۱۲۰۰ی کۆچی لە دایک بووه و بە هۆی هۆشمەندی و ئازایی و بازرگانی و دەوڵەمەندیەوە لە هەموو لایەکی کوردستان تەنانەت لە بەغداش ناسراوە و ڕێزی لێندراوه. حەمەد ئاغای باوکی پارێزگاری لە ئاوڕەحمان پاشای بابان کردووه کاتی هەڵاتنی لە پێش لەشکری شازادەی عەجەم وە هاتنی بۆ شاری کۆیە. هەروەها لەسەر داواکاریی محەمەد پاشای ڕەواندز بە خۆی و لەشکری کۆییانەوە چووە بۆ گرتنی قەلای (ژەنگار)، لە ئەنجامی شەڕدا قەلاکەیان گرتووه و محەمەد پاشا خوشکی عەلی بەگی داسنی دەداتێ کە بەدیل گیرابوو. شایانی گوتنە کە تاهیرئاغای کوڕی کە بوو بە سەرۆکی شارەوانی بەغدا لەو ژنە داسنیەیە.

حاجی بەکر ئاغا زۆر خزمەتی ئاین و زانیاری کردووە، ساڵی ۱۲٦۰ ک-۱۸٤۳ز مزگەتی گەورەی کۆیە دروست دەکات لەسەر کیسەی خۆی.ماڵی کردبووە یانەی زانا و شاعیر و ئەدەب پەروەران، خۆشی شاعیرێکی بەتوانا بووه، بە کوردی و فارسی بەناز ناوی (قاصد) شیعری داناوە. دیوانی شیعری لای ئەمین ئاغای کوڕی دەبێ، پاشان دەکەوێتە لای سەلیم ئاغای نەوەی بەلاّم بە داخەوە لە ئەنجامدا وون بووه. ئەم کەڵە پیاوە مەزنە ساڵی ۱۲۷۰ک-۱۸۵۳ز کۆچی دووایی کردووه.. حاجی بەکر ئاغا ۹ کوڕی هەبووه، لە هەموویان بە تەمەنتر و ناودارتر ئەمین ئاغای شاعیرە کە نازناوی (ئەختەرە) لە ساڵی ۱۸۳۹ک هاتۆتە دنیا و تەمەنی ۱۵ ساڵ دەبێ کە باوکی کۆچی دووایی دەکا، ناچار واز لە خوێندن دەهێنێت و لە جێگای باوکی ئەرکی بنەماڵەکەیان هەڵدەگرێ. هەر لەو ساڵەشدا خاتوو حەلیمەی کچی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە (باپیری مەلای گەورە)ی هێناوە.

ئەمین ئاغا پیاوێکی هەڵکەوتەی شاعیر و ئەدیب و بەرێز بووه، دۆستی حاجی قادر و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی شاعیر بووه، دیوەخانەکەشی هەمیشە بووەتە کۆڕی شاعیر و زانا و دەنگخۆشان و زۆر بەخشندە و دووربین و بلیمەت بووە. شارەزای لە سیاسەتیشدا هەبووه کەوا گەلێک جار بێزاری لە

حکومەتی عوسمانی دەربڕیوە[٢٩] و لە دژیان وەستاوە، تەنانەت هەجوی سوڵتانیشی کردووە و لەسەر ئەوەدا تووشی ئازار و دەربەدەری هاتووە. (ئەختەر) زۆر حەزی لە ساز و ئاوازی گۆرانی کردووە و شعری بە زمانی کوردی و تورکی و فارسی داناوە. شعرەکانیشی بەزۆری دڵدارین و تا بڵێی پڕ واتا و سۆزن. بە داخەوە ئەو مرۆڤە بەهرەدارە زۆر نەژیاوە و ساڵی ١٨٨٨ لە تەمەنی ٤٩ ساڵیدا سەری ناوەتەوە. شایانی گوتنە کە حاجی قادر لە ئەستەنبۆڵەوە یادی پیاوەتی و مەردایەتی ئەمین ئاغا و حەماغا دەکات و دەڵێ:

**دوو ئاغای ماوە وەک بیستومە ئەخبار**
**ئەمیناغا و حەماغای ساحیبی کار**
**ئەمین و پشتیوانی قەصری میلەت**
**نیگەهبانی خەزێنەی موڵک و دەوڵەت**
**لە دنیادا خودایە هەر بمێنن**
**بنەی بێ ئیتیفاقی هەڵکەنێنن**

## بنەماڵەی غەفوری

هیچ سەرچاوەیەکی نووسراوی چاپکراومان دەست نەکەوتووە دەربارەی ڕەچەڵەکی ئەم بنەماڵە تەنیا کتێبەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد نەبێت لەژێر ناوی (حەماغای گەورە) کە لەم دووایەدا کەوتە دەست خوێنەران، ئەویش پشتی بە هەندێک دەستخەت بەستووە و لە زاری ئەم و ئەو لە پیاوانی پیری کەمێک شارەزا سودمەند بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەم و مژێک لە مێژووی

٢٩- باوکم بوی گێرامەوە: ڕوژێک ئەمین ئاغا لە دیوەخان دەبێ یەکێک پێی دەڵێ: ئاغا وا فلانە ئافرەت شاربەدەر دەکەن، چونکە ئیشی خراپی لێ روو داوە.. ئەویش دەڵێ: ئەدی چییان لە کابرا کردووە؟ دەڵێ: ئەفسەرێکی تورکە و هیچیان لێ نەکردووە" ئەمین ئاغا گورج هەڵدەستێ و ڕوو دەکاتە سەرا، بەزۆر کابراش دێنن لەگەڵ ژنەکەدا سواری کەری دەکەن، ماست و دوشاوی پێدا دەکەن و هەردووک شاربەدەر دەکرێن.

بەسەرهات و چۆنیەتی بەجێ هێشتنی هەوارگەی باپیرانیان بەدی دەکرێ..
هەرچۆنێک بێت، گومان لەوەدا نیە کە ئەو خێزانە کوردە لە کوردستانی ئێرانەوە لەبەر هەر هۆیەک بووبێ روو دەکەنە گوندی (وەرتێ) لە ناوچەی خۆشناوەتی لەوێشەوە بڵاو دەبنەوە تا ئەوەی غەفور ئاغا ناوێکیان لە مێژوێکی نەزاندراودا روو دەکاتە شاری کۆیە لێی نیشتەجێ دەبێت و بناغەی بنەماڵەکەیان لەوێوە دەست پێ دەکات.

لە پیاوە هەڵکەوت و ناودارەکانیان حەمەئاغای کوری مەحمود ئاغا و سمایل ئاغای برا گەورەکەی کە لە شەرێکی دژ بە عوسمانیەکاندا دەکوژرێت. حەماغا پیاوێکی ئازا و نان بدەو پیاوانە و خاوەنی زەوی و زار و سەروەت و سامانێکی زۆر بووە و لە گرانیەکەی سەفەربەلگدا (جەنگی جیهانی) شاری کۆیە وەک شارەکانی تری کوردستان تووشی قات و قر~ی هاتوە. ئا لەو گرانیەدا قۆڵی مەردایەتی لێی هەڵدەکات و دەکەوێتە فریای برسی بێچارانەوەو هەموو رۆژێک هەشت تەنەکە ئارد لە ماڵی ئەو کراوەتە نان و چەندین مەنجەڵی گەورەش چێشت دابەش کراوە. زۆر جار حەماغا بە دەستی خۆی چێشتەکەی بە سەر هەژاراندا بەش کردووە و بەو جۆرە هەتا تا گرانی بەسەر چووە. ئیتر گەلێک خێزانی بێ نەوا و برسیی لە مردن رزگار بوونە، لەم باردشەوە زۆر رووداو و هەڵوێستی جوامێرانە لە چاوتێری و پیاوەتی حەماغا دەگێرنەوە(٣٠). شاعیری مەزن حاجی قادر لە پارچە شیعرێکدا باسی بەخشندەیی و مەردایەتی حەماغا دەکا ت و دەڵێ:

---

٣٠- باوکم بوی باسکردم گوتی: هەندێ جار کە حەماغا لەبەر دەرگای ماڵەوە بەدەر دەکەوت بەوەی رانەدەگەیشت کیسەی پارەی دەربینی ئەو رووت و پێچارەو برسیانەی لەوێ چاوەرێی دەبوون پەلاماریان دەدا دەیانخستە بن دەست و پێی خویان کاتێ پیاوەکانی بەگژیان دادەچوون حەماغا تێی رادەخورین دەیگوت نەکەن ئەزیەتیان بدەن ئەوانە هەژارن هەژاری خومانن کە راست دەبووە تووڕە نەدەبوو، دەستی دەکرد بە پارە دابەش کردن بە سەریاندا.

**کــه نەفــعــیکت نەبوو بۆ مــلک و مــیللەت**
**بە من چی نەقــشــبــەندی یا نەمــانی**
**کــەسێ پیــاوە کــە دانێ وەک حــەمــاغــا**
**لەبۆ ئەبنایی جــینسی نان و خــوانی**

پاش تیشکان و نەمانی عوسمانی ئینگلیز حەماغایان کردە (حاکم)ی شاری کۆیە کەچی مەرگ ماوەی نەدا لەم پایە زۆر بمێنێت، بەڵام ئەوەی شایانی باس و سەرنج راکێشانە ئەوەیە کە کۆیە لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەودا باری هێمنی و ئاشتی خۆی پاراستبوو. جا لەپێناو سوود وەرگرتندا پێویستە رای (مستەر های) بخەینە روو کە حاکمی سیاسی بووە و دەربارەی پیاوانی ناوداری کۆیە لە کتێبەکەیدا باسی کردووە. کتێبەکە لە ئینگلیزی وەرگێردراوە بۆ عەرەبی لە ژێر ناوی «سنتان في کردستان» ئێمەش بە ئەمانەت و بێ دەستکاری دەیخەینە بەرچاوی ئێوەی بەڕێز. چونکە راو بۆچونی تایبەتی خۆیەتی جا دەرهەق ئەو کەسانەی لێی دوواوە چەند پەیڕەوی بێ لایەنی و هەقیقەتی کردووە ئەوا دەیخەنە بەر مەزەندەی خوێنەری خۆشەویست - میستەر های دەڵێ:

"هیشتا لە رێگا بووین نامەیەکی حەماغام بۆ هات لە کۆیەوە، منیش بە ناوی حاکمی شار وەلامم دایەوە و پێم راگەیاند کە سبەی دێینە کۆیە. پێش ئەوەی بگەمە باسی شار، پێویستە باری ئیستای کۆیە دەربخەم، شارەکە بە درێژایی سەدان ساڵ لە نێوان دوو کۆمەڵی ناحەز و رکابەردا بۆتە دوو بەش، (بنەماڵەی غەفوری) و (بنەماڵەی حەوێزی). زۆربەی زۆری گوندو و زەوی و زاری دەوروبەری شارەکە هی ئەم دوو بنەماڵە کوردەیە، (حەماغا) کە پێشتر باسم کرد پێشەوای بنەماڵەی غەفوریانە. دەڵێن خوا تەمەنی ١٣٠ ساڵ درێژ کردوە[٣١] کەچی هێشتا بەتەواوی هۆشی لە سەرخۆیە چونکە دەوروپشتی زۆرتر بوو و لەبەر خواناسی و تەمەن درێژی لە هەر دوو لاوە رێزی لێندراوە،

---

٣١- حەماغا لە ٢/٨/١٩٢٠ لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، مستەر های لەبارەی تەمەن درێژی حەماغاوە بە هەڵە چووە.

بۆیەش (مقدم نوئێل) پێشنیاری کرد بیکەمە حاکمی شار.. سەرۆکی بنەماڵەی حەویزی ویڕای ئەوەی کە لە چاو رکابەرەکەی بێ دەسەڵاتە بەڵام حەویزی بۆیان هەیە بە پیاوە تێبووەکانیان بنازن، لەوانە عەبدوڵلا ئاغا خۆیەتی، تورکەکان مەیلیان دەکرد و بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەلاتێکی زۆری لە شارەکەدا هەبووە. کە باری دەوڵەتی تورکی لە ئەنجامی (ئاکربەست) گۆڕا بارێکی تر، بنەماڵەی غەفوری بڕیاریاندا کە بە جۆرێکی دیکە خۆیان بسەلمێنن. هەندێک لەوان جگە لە حەماغا بە هەلیان زانی کە (سواراغا) سەرۆکی هۆزی پیران هان بدەن ماڵی عەبدوڵلا ئاغا تالان بکات و پاشان پەلاماری کوێش بدات. چوار دەوری ماڵی عەبدوڵلا ئاغای بگری و کوڕێکی بریندار بکەن. حەماغا لەناو نووینی نەخۆشی و بە تاریکە شەو راست بۆوە و چوو هەراکەی دامرکاند. ئەو رووداوەش تەنیا پێش دوو رۆژ لە بەجێهێشتنی (ئاڵتون کۆپری)م بوو. پاشان های دەڵێ:

"سەعاتێکی مابوو بگەینە شار، پەنجا سووارێک لەسەر تەپۆلکە گردەکان دیار بوون بۆ پێشوازی و بەخێرهاتنی من هاتبوون. عەبدوڵلا ئاغا بەرگی ئەوروپایی لەبەردا بوو و ردێنێکی سپی شێوەی بەفری بەردابۆوە، جلەکانی زۆر جوان، دەفەی سینگی پان و توکن بوو تەنانەت لەم رۆژە ساردەشدا سینگی والآو رووت بوو، زۆری تری لەگەڵدا بوون بەلآم کەسی تری وا بەناویان تێدا نەبوو.. عەبدوڵلا ئاغا لە پێش هەمووان‌دا هات و بەخێرهاتنی کردم، بەلآم من دەست بەجێ پرسیاری حەماغام لێ کرد کە ئەمەی زۆر لە دڵ گران هات. ئەورۆژە کەش و هەوا زۆر سەخت بوو، ماوەی هیچ گفت و گۆیەکی نەدا، بە ماتی جۆتەسوار بە تەنیشت گۆڕستان و کەلاوەکاندا رێمان دەبری تا گەیشتینە کۆیە. لەدەرەوەی شار دیانەکان بەپیرمەوە هاتبوون لە پێش هەمووشیانەوە قەشە بەخۆیی و بە جل و بەرگی رەشیەوە. هەرچەندە رۆژی هاتنم بۆ کۆیە ناخۆش و بەتۆف و باران بوو بەلآم ئەوەی (پێ و قدوومی) بارانی لەگەڵدا بووایە بە پێی نەریتی کۆمەلآیەتی ئەوا هاتنی خێر و خۆشی لە دواوە بوود. یەکسەر بردمیانە سەرا، ژوورێکیان بۆ دانیشتنم ئامادەکردبوو، پیاوە ماقوڵەکانی کۆیە هەموو لەوێ کۆبوونەوە. پاش خواردنەوەی چای و

قاوه مەلا محەمەد ئەفەندی موفتی کە شەخسیەتێکی ئاینییە بە فارسیەکی جوان و پاراو گوتارێکی بەخێرهێنانی درێژی خوێندەوە. منیش بە پێی توانا بە باشترین شێوە وەلامم دایەوە. وا باشە لێرە وەسفی ئەو شەخسیاتانە بکەم کە لە پێشوازیدا بەشدارییان کرد. لە پێش هەمووان حەماغایە ئەو پیاوە بێدەنگ و هێمن دانیشتبوو جگە لەوەی کە جار جار گوێت لە پرخە پرخی دەبوو و بەردەوام قەنەی دەکێشا کە درێژیەکەی دوو پێ زیاتر بوو، قەدی پێچراو بنەکەی لە بەردی رەش درووست کرابوو، پیاوێکی تێک سمڕاوی چووار شانە بوو، ئەگەر تێنی لەش و تەمەن درێژی رەچاو بکەین، پیاوێکی بەرز و لێوەشاوەیە، دەڵێن بە درێژایی تەمەنی و لە ساردترین کاتی زستانیشدا ئاوی گەرمی بۆ دەست نوێژ و خۆ شوشتن بەکار نەهێناوە. تەمەنی لەنێوان ٩٥ تا ١٠٠ ساڵێک دەبێت. ٦٥ ساڵ زیاترە کە سەرۆکی بنەماڵەکیەتی. شێوەی ژیانی پڕ لە هەرا بووە، سەردەمی لاوێتی دێتەوە یاد کە چۆن بەربەرەکانێی لەگەڵ پاشاکانی رەواندوز و سلێمانی کردووە کە بە نۆبەت دەستیان بەسەر کۆیەدا گرتووە. لە هەرەتی گەنجایەتیدا بە گژ تورکەکاندا چووە، پاش کوشتارێکی زۆر گرتوویانە و ١٥ ساڵ لە بەندینخانە ماوەتەوە. لەو شەڕ و هەرایانەدا گوێیەکی زامدار بووە هەر ئەوەندەی ماوە کە لێ بیێتەوە، تا ئێستاش کێمی لێ دێت و ئازاری هەیە. لەگەڵ هۆزەکانی چوار دەوری کۆیەش تێک قڕاوە، کە هۆزی هەمەوەند هێرشیان هێناوەتە سەر هەندێک لە گوندەکانی ئەو، داوای یارمەتی لە عەشیرەتی (شێخ بزێنی) کردووە. کە لەوە سەرکەوتووە ئەوسا شێخ بزێنیشی لە دێهاتەکان دەرکردووە و بۆ خاوەنەکانی گەڕاندۆتەوە. حەماغا ناهۆمێدی و ئارەزوویەکی بە ئاوات نەگەیشتوی پێوە دیار بوو، هەر منداڵێکی دەبوو بە ساوایی دەمرد، کەس نەبوو شوێنی بگرێتەوە، پاشان کە تەمەنی گەیشتە ٩٠ ساڵ خودا کوڕێکی دایێ ناوی نا (محەمەد زیاد). کە من گەیشتمە کۆیە محەمەد زیاد تەمەنی ٨ سالان بوو و لە گوندێکی چەند سەعاتێک دوور لە کۆیە دەژیا[٣٢]. حەماغا پیاوێکی

٣٢- حەماغا هەر منداڵێکی دەبوو نەدەژیا، کە کاکە زیادی بوو تا لە چاوەزار دوور بێت و بوی بمێنێ، دەینێرێتە گوندی (شیوا شوک) لە ناوچەی کۆیە.

خۆش مەشرەب و دڵگیر بوو، لە کاتی دوواندندا سەرگوزشت و بەسەرهاتی خۆی دەگێڕایەوە، ئەگەرنا زدردەخەنەیەکی ناسک دەیگرت کە نیشانەی گیان پاکی و لێبوردەیی بوو دەکەوتە پرخ و هۆری خەو. تاکە پیاوە لە کوردستان کە ناوی بە بەخیلی نەهاتووە، لەگەڵ دڵپاکی و روخسار جوانی خۆرسکیەوە، تا بڵێی سەرکەش و پشوو تەنگە، لەسەر خزم و کەسان توند و زاڵ بووە و لە ناحەزانی خۆی لە کەس نابووریّ. هەندێک وردە ناکۆکی ساڵانی پێشوو دێنێتەوە گۆڕێو، کینەو خۆشەویستی هەردووکیان کاریان کردۆتە سەر رەفتاری.

پاش حەماغا مستەر های دێتە سەر باسی عەولاغا دەڵێ: عەولاغا پیاوێکی بەژن باریکی قەد چەماوەیە، لە دەوری ٦٥ ساڵیدایە، دەم و چاوێکی رەقەڵەی پێوەیە کە رۆژگار کاری تێ کردووە. برۆکانی پڕ تووکی رەش و مەیلەو شینە، روخساری هەردەم گرژ و هەڵچوو دیارە بە تایبەتی کە جلە ئاورپیەکان لەبەر دەکات. لە کەین و بەیندا زۆر زیرەکە و کە گەیشتمە کۆیە هەر سەرەک شارەوانی بوو. زۆربەی خزمەکانی مەیلیان نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا رایان لە عەقڵ و هوشمەندیەتی هەبوو ئەوەش گەلێک زیاتر بوو لەوەی کە حەماغا هەیبوو. لە هەموو خزمەکانی دیارتر جەمیل ئاغای ئامۆزای بوو[٣٣]، پیاوێکی کەڵەگەتی بەژن رێک و دەم و چاوی کەمێک باریک بوو. لەبەر ئەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ هەردوو بنەماڵە ناحەزەکە باش بوو هەردەم هەوڵی داوە تەبایی لە نێوانیاندا هەبێت و لە پێناو نەهێشتنی ئاژاوەدا گیانی خۆبەختی هەبووە. لە سەردەمی لاویدا چوار ساڵ سەرەک شارەوانی بووە، تاکە کەسیش بووە کە ئەو پایەی بۆ بەرژەوەندی شارەکە نەک بۆ سوودی خۆی

٣٣- جەمیل ئاغا کوڕی ئەسعەد ئاغای حەوێزیە، برازای ئەمین ئاغا شاعیرە (ئەختەر). پاش حەماغا بوو بە قایمقام، لە چلەکانیشدا لە چەند دەورەیەک بوو بە نوێنەر لە پەرلەمانی عیراقدا. پیاوێکی لێهاتوو و خێر خواز و خاوەنی هەڵوێستی دلێرانە بووە، لەگەڵ مەلای گەورە هاوبەشی ئەو عەرزوحاڵەی کردووە کە داویانەتە حاکمی سیاسی بو دامەزراندنی دەزگای سەربەخو بۆ کورد. لە ١٩٤٦/٣/٢٤ کۆچی دووایی کردووە.

کـردبێ. دوو برای چاپووک و وریای هەیە (جـەلال و جـەلیل). لە کـۆیە مـەلا
زۆرن کە مـەندیلی سپی دەپۆشن و لە پێش هەمواندا مـەلا محەمەد ئەفەندی
دێت، پیـاوێکی بەژن درێژە لە ناوەڕاسـتی تەمـەن دایە، خـاوەن زانیـارییـەکی
زۆرە و بەهرەیەکی لە ئەندازە بەدەری لە دواندا هەیە، لە هەر شـوێنێک بێت
ئـخـاوتن هەر بۆ خـۆیەتی، ئەوەش لە بەخـتی باشـەوەیە کـە ئەو بەهرە و
هۆشمەندیە فراوانەی وای کردووە لە هەموو کەس زیاتر دڵت پێ بکرێتەوە وە
هەردەم شـانازی دەکـا کـە لە هەمـوو زاناکـانی کـوردسـتـان زاناترە، ئەوەش لە
ڕەوشـتی چینەکـەی خـۆیەتی. زانایەتیـەکـەی لە گـومـان بەدەرە و هەر چەندە
پیاوێکی ئایینیە بەڵام بایەخ بە ژیانی کۆمەڵایەتی و دونیاش زۆر دەدات.....
پاشان های دەڵێ: کە مەراسیمی بەخێر هاتن کۆتایی هات لەگەڵ حەماغا
هەردو ئەو مـاڵە ڕۆیشـتین کە بۆ منی ئامـادە کـردبوو، هەوڵی دەدا بە فـارسی
تێکەڵ بە تورکیـەکی سـەیر و بەدەنگی بەرز لەگـەڵم بدوێت کـە لە وشـەکـانی
نەدەگەیشتم، کاتێک وەلامیشم دەدایەوە لەبەر گوێ گرانی لەمن نەدەگەیشت.
پاش نانخواردنێکی باشی نیوەڕۆ حەماغا بەجێی هێشتم. چاوم بە ئەشراف و
ڕووەتدارەکانی کـۆیە کـەوت، کۆمەڵێک گیـروگرفـتم لەپێش بـوو لە هەموویان
گـرنگتـر ئاشت کـردنەوەی بنەمـاڵەی غـەفـوری و بنەمـاڵەی حەوێزی. دەبایە
تەرتیباتی حوکم لە شارەکە بکەم کە بۆ هەردوو لا بگونجێت و ئەو زیانەی کە
عبدوللا ئاغا لێی کەوتبوو لە سوار ئاغـای پیران بیسـتێنم. پێشـتر بڕیارم
دەرکردبوو حەماغا ببێتە حاکم ئیتر لەبەر ئەوە پێویست بوو وەزیفەکانی کەم
باخـتـر وا دابەش بکەم کــە هەمــوو لایەک پێی ڕازی بن. بۆ ڕۆژی دووەم
توانیم.... هتد.



ئەم وێنە مێژووییە ساڵی ١٩٣٣ لە کۆیە گیراوە..
ریزی یەکەم لە چەپ بۆ راست: عەبدولڕەحمان خدر، ئەوسا مدیر ناحیەی تەقتەق بوو- مەلای گەورە- ساڵح زدکی بەگ ساحیبقڕان، ئەوسا قایمەقامی کۆیە بوو- ردفعەت، مەئموور مەرکەز..
ریزی دووەم لە چەپ بۆ راست: سەلاحەددین کوڕی زدکی ساحیبقڕان- مەجید نوورەددین- محەمەد خەلیفە
ساڵح زەکی بەگ ١٨٦٦-١٩٤٤ ئەم دوو دێڕ شیعرەی لە پشت وێنەکە نووسیوە و بۆ مەلای گەورەی ناردووە.

**هات و چوونە حاڵی عالەم حاڵی نابێ پایەدار**
**حاڵی رابوردوو بەحەسرەت با بمێنێ بە یادگار**

# مەلای گەورە و
# کۆششی کۆمەڵایەتی

جەلیزادە بە مێشکێکی ڕۆناک و گیانێکی ئازادەوە هاتە کۆمەڵگایەکی نەخوێندەواری چەوساوە و هەژار، کۆمەڵگایەکی کە لە ترسی دەجال دەلەرزی و بەهیوای هاتنی مەهدی دەگەشایەوە، جا لەو هەموو کارەسات و ناکۆکی و تەنگ و چەڵەمە نالەبارانەی کوردەواریدا نەیتوانی چاویان لێ بپۆشێت. قۆڵی فیداکاریی لێ هەڵماڵی و خۆی هاویشتە ناو کۆڕی خەباتەوەو دەستی نەتەوە هەژارەکەی گرت بەناو هەزاران قۆڵت و بەرهەڵستا رووی کردە دونیای ئازادی و سەرفرازی و، کۆڵی نەدا تا ئەو ڕۆژەی چرای پرشنگداری ژینی کوژایەوە. بێگومان ڕێگای خەبات و تێکۆشانەکەی گەلێک سەخت و دژوار بوو چونکە کلۆڵی و ناتەواوی هەموو سوچێکی کۆمەڵایەتی هۆزەکەی وەک تەم داگرتبوو، ئەویش دوژمن و ناحەزی هەموو جۆرە ناتەواویەک بوو و هیچ کەم و کوڕی و ناتەواویەک نەمابوو هەڵمەتی نەباتە سەر. دەتوانین بڵێین مەیدانی فراوانی کۆشش ئەمانە بوون:

- بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری.
- هاندانی زانستی و خوێندەواری.
- ئازاد بوونی ئافرەت.

**یەکەم: خەبات بۆ بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی**

مەلای گەورە لەوڕۆژەی کە ڕاست و چەپی خۆی ناسیوە تا سەری ناوەتەوە خەریکی چاوکردنەوەی نەتەوەکەی بووە، ڕیی ئازادی و سەربەخۆیی نیشان داون بێ ئەوەی گوێ بداتە مەترسی و تەنگ و چەلەمە ترسناکەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە لەم ڕێگایەدا تووشی دەبێت و زۆر بە ئاشکرایی و ڕاستی نەتەوەکەی خۆی هۆشیار کردۆتەوە، هۆبەکانی دواکەوتن و بە ئاوات

نەگەیشتنی بەر چاو خستوون. وەنەبێ کوردایەتی و نیشتمانپەروەری مەلای گەورە لە سۆز و عاتیفەی گیانێکی گەرمەوە هاتبێ، بەڵکو لە سەرچاوەی زانینێکی بێ پایان و هۆشێکی بێ مانەندەوە هەڵقوڵیوە. وەک سەیر دەکەین زۆربەی شیعرەکانیشی بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە داناوە تەنانەت وەعز و ئامۆژگارییەکانی ئیوارەی رمەزانانیشی کردبوو بە کۆڕێکی ئەدەبی و زانستی، شیعرە ئاگرینەکانی حاجی قادر و شاعیرە ناودارەکانی تری بۆگوێگران خوێندوتەوە. هەروەها گەورەیی جەلیزادە لەوەدا بووە کە بە چاوی زانست و واقیع سەیری دونیای سیاسەت و باری کۆمەلایەتی و دوارۆژی گەلی کوردی کردووە، رای خۆی دەربڕیوە کە هەر نەتەوەیەک دەبێ بە زەبری دەست و بازوو و بە هەوڵ و تێکۆشانی رۆلەکانی بگاتە ئاوات، دەنا دوعا و نزا و پاڕانەوە ئاکامی بێ دەسەلاتی و لاتی و پەرێشانیە. شیعرە بەهادارەکەی حاجی قادری هێناوەتەوە بیریان کە دەڵێ:

**پاڕانەوە وتەوەککول لەم عەسرە چارە ناکا**
**تیرە دووعایی جەوشەن پەیکانە حیرزی مەیدان**

هەروەها کە حاجی گوتوویەتی:

**فائیدەی گەر بدایە زیکر و دوعا**
**دەبووە قاڕوون گەدای سەر ڕێگا**

جا لەسەر روانگەی ئەو بیر و فەلسەفەیەدا جەلیزادە نەهاتووە وەک زۆر لە پیاوانی ئایینی و خێرخوازانی دیکەی کوردەواری بکەوێتە سکالا و نزا و دەردی دڵ هەڵڕشتن یاخود بە عاتیفە و سۆز و شیعری ناسک دەرد و کێشە و ئەشکەنجەی گەلی کورد چارە بکا، بەڵکو وەک شۆڕشگێڕێک هاتۆتە مەیدانی هەوڵ و خەبات روو بە رووی کاربەدەستان وەستاوە و داوای مافی رەوای نەتەوەکەی کردووە و رایەکانی ئەو لە پەنای پەردە و پەروای سیاسەتی خۆیاندا بایەخی پێ دراوە و بەهەندیان وەرگرتووە. زۆریشیان سەلماندوویانە کە داواکاریەکانی دەربارەی مافی نەتەوایەتی هەقە و لە جێگای خۆیەتی، بەلام

بەدبەختیی کوردی ستەم دیدە و هەژار، رۆژگار و باری سیاسەت هەمیشە بۆی نالەبار بووە، بەرژەوەندی داگیرکەری بێگانە لەگەڵ ئاواتی کوردی ماف خوراو هەرگیز نەگونجاوە و ئەو وەسیقانەی لەم کتێبەدا دێتە بەر چاو هەڵوێستی بەجەرگ و هەوڵ و تەقەلای بەردەوام و گیانی بێ گەردی کوردایەتی جەلیزادەمان بۆ دەردەخەن.

**دووەم: هاندانی زانست و خوێندەواری**

جەلیزادە مەلایەکی لە باری کۆن و نوێ شارەزا بوو. ئاگادار بوو لە راپەڕین و جولانەوەی گەلانی ئازادی خوازی جیهان، وشیار بوو، زانیاریەکی باشی هەبووە لە باری کۆمەلایەتیی نەتەوە پێشکەوتووەکان بۆیەش زۆر لایەنگری خوێندن و زانستی نوێ بووە. بە هەموو توانای هەوڵی داوە خوێندەواری لەناو کورد بلاو ببێتەوە، لە ساڵی ١٩٢٦ شاندێک لە کاربەدەستانی وەزارەتی (مەعاریف- پەروەردە) بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرێکی کشتیی وەزارەتەکە دەچنە کۆیە و سەردانی مەلای گەورەش دەکەن، سەیریان پێ دێت کە دەبینن مەلای گەورە مێزەری لەسەر نیە بەڵکو جەمەدانی بەستووە!! و سەریان لەوە زیاتر سوور دەمێنێ کە لەسەر مێزەکەیدا دەبینن کۆمەڵە کتێبێکی داناوە وەکو (حیاة نابلیون، سر تطور الامم، کوستاف لوبون، جمهوریة افلاتون، علم طبقات الارض، روح الاشتراکیة، العقل الباطن) دانەری (فرۆید). دیار بوو کە سەیریان پێ هاتووە چۆن زانایەکی ئایینی ئەم کتێبانە دەخوێنێتەوە؟ جەلیزادەش پێدەکەنێت دەڵێ: لاتان سەیر نەبێ، عیلم هەر عیلمە چ لەژێر سیدارە بێ یان شەفقە یاخود کلاو و جەمەدانی بێ، ئەوانە هەمووی مەزاهیری خارجین، بەلام زانست لەناو مێشک جێگیر دەبێ. عیلم و زانست وەکو خواردنە بە درێژایی ژیانی پێویستیت پێ دەبێ. ئێوە کە پیاوانی پەردە و فێرکردنن نابێ بە مەزاهیر هەڵبخەڵەتێن زانست میراتی بەشەریەتە.

لەسەر داواکاری جەلیزادە قوتابخانە لە کۆیە کرایەوە، هانی خەڵکیشی

ددا بۆ خوێندن. بەمەش نەوەستا و ساڵی ١٩٢٦ نەک کوڕی خۆی بەڵکو کچی خۆشی (نەجیبە) لەگەڵ کوڕان ناردە قوتابخانە کە ئەوسا (بەڵکو ئێستاش) کچ ناردن بۆ قوتابخانەی کوڕان هەنگاوێکی زۆر فیداکارانەیە بە تایبەتی بۆ زانایەکی ئاینی. دەبێ خوێنەری ئیمڕۆش ئەوە بزانێت کە لەو بارودۆخەی ئەوسای کوردەواری تەنانەت ناردنی کوڕانیش بۆ قوتابخانە بە شتێکی بێ دینی دەزانرا و ئەو باوکەکەش بە گوناهبار ناونراوە، چ جا ئەوەی کچ!!

مەلای گەورە زۆر رقی لە چارەی کۆنەپەرست و باوەڕ پوچەڵ و نەفام و نەزان بۆتەوە، بە چاوێکی پڕ هیوا سەیری لاوانی تازە پێگەیشتوی قوتابی کوردی کردووە. بە بۆنەی بڕیاری (عصبة الامم) کە هەموو نەتەوەیەک مافی هەیە بە زمانی خۆی بخوێنێت و بنووسێ، عەبدول رەحمان شەرەف بەڕێوەبەری قوتابخانە و مامۆستاکان ساڵح قەفتان و عەزیز فەرەج و عەلی شەوقی کە زۆر گیانی کوردایەتیان لە ناو قوتابیان بڵاو دەکردەوە، ئەو رۆژە بە شێوەی خۆپیشاندانێک بە خۆیان و قوتابیانەوە روو دەکەنە بەر دەرگای سەرا. قایمقام و موفەتیشی ئیداری کە ئینگلیز بووە لەگەڵ خەڵک و حەشاماتێکی زۆر لەوێ دەبن، ئا لەو کاتەدا مەلای گەورە بەرانبەر خەڵکەکە رادەوەستێ ئەم پارچە شیعرەیان بۆ دەخوێنێتەوە کە سۆز و جۆشێک دەخاتە دڵی خەڵکەکە. قایمقام و کابرای ئینگلیز پێ پەست و نارازی دەبن، ئەم شیعرەش یەکەم شیعری نەتەوایەتی مەلای گەورە بووە:

**هەستە پێشکەوە ئەی لاوی کۆیی**
**ئاگات لە خۆ بێ کاروان رۆیی**
**بە نووری عیلمی رێگا بەدەرخە**
**بە زۆری بازوو باری بە سەرخە**

جەلیزادە هەر بە هاندانی خوێندن وازی نەهێناوە بەڵکو تا توانیشی بەربەرەکانێی ئەو خورافاتانەش بکا کە لە بەرگێکی ئاینیەوە چووبووە مێشکی

خەڵکەکە و لە پێناو ئەو کۆششەدا ببوو بە نیشانەی توانج و تانەی کۆلکە مەلا و شێخەکانی کوردستان کە بە زەرگ و نوشتە و کشتەک نانیان پەیدا دەکرد. بەڵام مەلای گەورە وازی نەدەهێنا و هەر دەی فەرموو:

**بە ریشی پان و پرچی پڕ لە ئەسـپێ**
**بناغــەی ئیـشی کــوردان چۆندەچەسپێ**

پاشان دەڵێ:

**تەمــاشــاکــەن چیـــایان چۆن دەکـــۆڵن**
**هەتاکـــەی ئێـــوە هەر بەرمـــاڵ بەکـــۆڵن**

مەلای گەورە بڕوای وابوو هەر میللەتێک بێتەسەر ئەو بیر و رایانەی کەوا عیسا و مەهدی رزگاریان دەکات و گوایە دونیاش هەندێ بەبەردەوە نیە و، ئەوا ئەو گەلە هەرگیز ناجووڵێتەوە و ئومێدی ژیانی لێوە ناکری بەتایبەتی بە گوێرەی ئەو خورافاتەی کە گوایە ئادەمیزاد هەرچی بیکا سوودی نیە، ئیتر خۆ ماندوو کردنی بۆ چیە؟.. لەم بارەیەوە چەند نامەیەکی داناوە بە کوردی و عەرەبی کە ئەسڵی باوەڕی ئیسلامی تێدا دەرخستوە بۆ ئەوەی عالەم بە درۆو دەلەسەی چەشەخۆران هەڵنەخەڵەتێن و مێشکیان لە شتی پڕو پوچ پاک ببێتەوە. لەو کتێبانەی کە زۆر نرخدارن، بە عەرەبی ئەمانەن: (الاشخاص الستة) و (القاعد في العقائد).. وە بەکوردی: (فڕی فڕی قەل فڕی) کە لەم کتێبە دا خستمانە بەر چاوی ئێوەی بەرێز، (عەقیدەی ئیسلام) شایانی گوتنە کە مامۆستا زۆر رقی لە (صرف و نحو) بووە، لای وابووە خۆماندوو کردن بەم شتانەوە زیاتر لە پێویست تەمەن لە دەست چوونە کە دەڵێ:

**عـــیلمی تەبیـــعـــەت عـــیلمی خـــودایە**
**قـــالەو قـــەوەلە گـــشـــتی هەبایە**
**عـــیلمی کـــیـــمـــیـــات گـــەر نەخـــوێندووە**
**بە خـــوا نازانی خـــوا چی کـــردووە**

**سێیەم: ئازاد بوونی ئافرەت**

ئازادبوونی ئافرەت ئامانجێکی بەنرخ و پیرۆزی مامۆستا بووە لە تێکۆشان، ئەو ئافرەتەی کە تا ئێستا لە وڵاتانی رۆژ هەلاتدا کڕین و فرۆشتنی لەسەرە، باوەڕی وابوو کە پێویستە مافی خۆی وەرگرێ رێگای سەربەستی بدرێتێ تا ببێتە ئەندامێکی پڕ سوود لە ناو کۆمەڵدا، دەبێ لە کۆتی دیلیەتی رزگار ببێت و لەژێر کابووسی ترس و لەرز دەرباز بێ تا دڵ و گیانی تاریکی بە ژیانێکی هێمن و ئازاد بکرێتەوە. مەلای گەورە دژی ئەوەبوو کە لە کاتی جوودابوونەوەی ژن و مێردێک منداڵ بە ساوایی بدرێتە باوکەکە چونکە هەر ئەو دایکەیە کە بە خوێنی جگەر و باوەشی گەرم و گیانی خۆبەختکردن و خۆشەویستی کۆرپەکەی پێ دەگەیێنێت و پەروەردەی دەکا. ئەمانەش خۆراکی هەرە پێویستی تەن و هۆش و دڵ و گیانی ئەو منداڵەیە، بۆیە مەلای گەورە بە ناڕەوایی زانیوە ئەو ساوایە لە دایکی دابپڕێت. هەروەها مەلای گەورە لەسەر ئەو باوەڕەش بووە کە لە مەسەلەی شایەدیدا ئەو کارانەی یادکرنەوەیان تێدا نەبێ پێویستە ژن وەکو پیاو حیساب بکرێ. تەنانەت جارێک بەشایەدی یەک ژن کردوویەتە جەژن کەچی بەگوێرەی نەریتی و بڕوای پیاوانی تری ئاینی دەبایە دوو ژن شایەدی بدەن.. جەلیزادە بیر و رایەکانی خۆی دەربارەی ئافرەت لەم پارچە شیعرەدا دەری بڕیوە کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **بڵێین بە قەومی کوردان** | **دەستی من و دامێنیان** |
| **عەیبە بە هەقی یەزدان** | **ژن هێنان و تەلاق دان** |

پاشان دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **دۆڵ و زوڕنا و هەڵپەڕین** | **ژنێ بۆ کورمان دێنین** |
| **زۆر پێ ناچێ دەبینین** | **شەڕو شۆڕو تێک هەڵدان** |
| **ئەوەڵ خەزور و خەسو** | **تێ دەکۆشن دوو بە دوو** |
| **بە دزی یا روو بە روو** | **لێکیان دەکەن بە خەندان** |
| **رۆڵە ژنت تەلاق دە** | **بۆت دەهێنم هەتا دە** |
| **لە کچانی بەگزادە** | **بیکەینە خەنە بەندان** |
| **دەبینی بووکی ساڵی** | **دەری دەکەن لە ماڵی** |
| **بە تای سۆڵ و بەرماڵێ** | **بێ ئاوێنە و بێ کلدان** |

# مەلای گەورە و
# مافی چارەنووس

لەم دووایەدا کۆمەڵێک دیکۆمێنتی بەریتانی ئاشکرا بوون کە بە پێی یاسای بەریتانیا دەبێ بە لانی کەم ٣٠ساڵی بەسەردا بڕوا، دەشێ بڵاوبکرێتەوە پەردەی نەهێنی لەسەر لابدرێ دکتۆر ئەحمەد عوسمان لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕایە سەر عەرەبی و پەیتا پەیتا لە گۆڤاری (الثقافة) بڵاوی کردەوە. ئەوەی پەیوەندی بە مەلای گەورە هەبوو لێرەدا وەرمان گێڕایە سەر کوردی.

لە راستیدا ئەمە لاپەڕەیەکی شاراوەی بەسەرهات و رەوتی سیاسی گەلی کوردە، هەروەها لاپەڕەیەکی گەشەداری پڕ شانازی هەڵوێست و خەباتی جەلیزادە دەستنیشان دەکات کە لەو بار و دۆخە ناسک و پڕپایەخە مێژوەدا بۆتە نوێنەرێکی راستەقینە و زووبانی حاڵی نەتەوەی خۆی، وەک سیاسەتمەدارێکی ئازا و زرنگ رووبەرووی کاربەدەستان وەستاوە و هیچ دەرفەتێک و هەل و مەرجێکی لەدەست نەداوە بۆ هاتنە دی مافی سەربەخۆبوونی کورد. ئاکامی هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامی جەلیزادە وای کردووە زۆر لە کاربەدەست و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز رایەکانی پەسەند بکەن و بیسەلمێنن کە داواکاریەکانی مەلای گەورە دەربارەی چارەنووسی کورد پێداویستیەکی مێژووییە. بەڵام رۆژگاری نالەباری دونیای سیاسەت هەمیشە ئاواتی کورد لەگەڵ بەرژەوەندیی وڵاتانی رۆژئاوا نەگونجاوە. ئیمڕۆ وەک سەیری دەکەین گۆڕانکاریەکی بەرفراوان لە جیهاندا هاتۆتە کایێ و مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی تەسکی ناو کوردەواری خۆمان دەرچووە و تەنانەت گەیشتۆتە ناو کۆشک و تەلاری گشت کاربەدەستی میللەتانی پێشکەوتوو. بۆیە دەبێ بە چاوی گەشبینی سەیری ئاسۆی رووناکی دووا رۆژی کوردو کوردستان بکرێت کەوا رەنجی ئەم تێکۆشەرە و هەزارانی تێکۆشەری تر بە فیڕۆ نەچوون و ناچن.

## بەڵگەنامەی یەکەم

دیکۆمنتی ژمـــارە ٣٧١- ٥٠٦٩ یا ١٢٤٥٧- وەزارەتی هیند. ئابی ١٩٢٠.

دانەیەک لە یادداشت و ئەوراقی حـاکـمی مـدنی تێـدایە لە ژێر ژمـارە (٢٤٣٠٤/ ٥٩/ ١٠٢) لە ١٩ی ئابدا دەربارەی رایەکانی ملا محەمەد کە لە گفـتوگۆیەکـەی کۆیە دەری بڕیوە. هەروەها دانەیەک لەو نامەیە کە لەلایەن جێگری ئەفسەری سیاسی ئەو شارەی (مەبەست شاری کۆیەیە) تێدایە کە دەڵێ: بەلای منەوە بایەخیکی گرنگی ئەوتۆ لە داواکاریەکەی نابینم بە دانانی حـاکـمێـک. باوەڕم وایە تاکە وەلامـێـک کـە بۆ ئەوە بدرێتەوە ئەوەیە: ئێـمـە ئێستا پێویستە چاوەڕوانی مەرجەکانی پەیمانی ئاشتی (واتە سیڤر) بین.. من هەوڵم دا راکانی هەولێر تیک بکەمەوە بەلام بە سەرکەوتنیکی کەم، شارەکە زۆر دوورەپەرێزە (متـحفظ) و ئەشرافـەکـان دژی حوکمی کوردی رادەوەستن و ناخوازن هیچ پەیوەندیان لەگەڵ شەریف (پاشاکەی ناوبراو(٣٤)) هەبێت.. وا

٣٤- شـەریف پاشـا: ١٨٦٥-١٩٤٤ کـوڕە گـەورەی (سـەعـیـد پاشـای کـوڕی حـوسـێن پاشـایە)، خێـزانەکـەشی خـاتوو ئامـینە، نەوەی محـەمـەد عـەلی پاشا والی مـیـسری بەناوبانگ و خـوشکی (صـدر الاعظم- واتە سـەرۆک وەزیری دەوڵـەتی عـوسـمـانی) محەمەد سەعید حەلیم پاشایە.. شەریف پاشا جەنەڕاڵیکی پایەبەرز و سـیاسییەکی هەڵکەوتەی کـورد بوو مـاوەی ١١ سـاڵ وەزیری مـفـەوزی دەوڵـەتی عـوسـمـانی بوو لە (ستوکهوڵم) پاشان لە ١٩٠٩ تووشی کێشە و گیروگرفت دەبێ، وڵات بەجێ دێڵێت و بە گلەرانە ژیان لە فـەرەنسـا بەسـەر دەبات. لە ١٩١٤ لەگـەڵ بەریتـانیـا کـەوتنە گفتـوگو بەو مەرجەی کە سەربەخۆیی بدرێ بە کوردستان و پەیمانیدا بەیارمەتی دانی کورد بۆ لەشکری سوێندخۆران. جگە لەمە لە١٩١٨ لە فەرەنسا چاوی بە (سێر پێرسی کوکس) کەوت و مەسەلەکەی لەگەڵدا دووبارە کردەوە. پاش کوتایی جەنگ کۆمەڵە تێکۆشەرەکانی کورد بڕیاریان دا شەریف پاشا ببێتە نوێنەریان لە ئەنجوومەنی ئاشتی و داوای مافی چارەنووسی کورد بکات. هەرچەندە گیروگرفتی هاتە پێش بەلام کۆڵی نەدا و وەکو سـیاسـیـەکی زرنگ و بە جەرگ و لێهـاتوو توانی هەقی کورد بخاتە بەر چاوی کـۆنفـرانسـی ئاشـتی لە فـەرەنسـا و بناخـەی سێ بەندە گـرینگەکـەی ڕێککەوتننامەی سیڤەر بۆ مافی کورد دیار خست.

پێ دەچی ئەوان حەز بە گۆڕانکاریەکی فراوان لە تەرتیباتی ئێستادا نەکەن و وابزانم دانانی ئەنجومەنێکی شار ئاواتی سیاسیان دابین دەکات و لێرەدا کۆمەڵێکی خەڵکی سەر بە تورکەکانیش هەیە بەڵام زۆر بچوکن و لە بنچینەدا لە فەرمانبەرە دەرکراوەکان پێکهاتووون.. وا یاداشتێکتان بۆ دەنێرین کە لە لایەن مەلا محەمەد ئەفەندی حاکمی شەرع و جەمیل ئاغا جێگری حاکمی شارەکە مۆرکراوە بەبێ دەستێوەردانی ئێمەوە و لە شێوە دەقەکەی خۆی ئاراستەی تۆی دەکەین:

دوێنێ بە سەردانێکی رۆتینی چومە دیوەخانەکەی مەلا محەمەد، لە راستیشدا بۆ مەبەستی پێکەوتن لە راکانی قستنطینیە دەربارەی باری (ئەستەنبوڵ) کە بەهۆی تورکەکانەوە پەیدا بووە. هەواڵی ئەم بڕیارە هێشتا نەگێشتۆتە ئێرە و پێناچێ راگەیاندنی بڕیارەکە بە هیچ شێوەیەک بایەخی لای مەلا محەمەد هەبێت، گوتی: ئەوە جێی داخە کە شارەکە و رێبازە ئاویەکان بۆ ژێر دەستی بەریتانیا بەجێ نەهێشتراون. بەڵام ئەو بەتەواوی رای خۆی دەربڕی کەوا جێی دانایی نیە هاوپەیمانەکان تێکڕا دەستی بەسەردا بگرن، بە پێچەوانەی ئەوە، ئەو وای پێ باشترە شارەکە لە ژێر حوکمی تورکدا بێت بەڵام ئەوەی دەربڕی کە لە پێناو دابینکردنی سەربەستی بازرگانی و هاتووچۆ گەلوەکان (المضايق) لە ژێر دەسەلاتی بەریتانیادا بمێنن و هەر چەندە تورکەکان شاری ئەستەنبوڵیان بە دەستەوەیە مەلا محەمەد پێی هەراسان نەبوو..

لەلایەکی دیکەوە مەلا محەمەد تەواو هەراسانی پێوە دیاربوو ئەگەری گەڕانەوەی کوردستان بۆ حوکمی عوسمانی بەدکار. پاش گفتوگۆیەکی درێژ دەربارەی حوکمی عوسمانی لەم شارەدا لە دووای هێنانەوەی کۆمەڵێک نموونە لەسەر کردەوەی نەشیاوی لە ئاسا بەدەر کە تورکەکان لێرە و لە شوێنانی دیکەدا کردوویانە، پێی لەوە داگرت کە پاش ئەو رەفتارە دادپەروەرانەی ئەو چوار ئەفسەرە سیاسیە بەریتانیانەی یەک لە دووای یەک، مەلا محەمەد لە ستایش بەولاوە هیچیتری لا نەبوو کە ئەوانە بە پێچەوانەی هاوچەشە

تورکەکانیان بوونە. مەلا محەمەد بە باوەڕەوە گوتی: هیچ ئومێدێکی دەربازبوونی کوردستانی نیە تەنیا لە ژێر سایەی بەریتانیا و ئاراستەی ئەو نەبێ و مەلا محەمەد بەتەواوی سوور بوو لەسەر ئەو رایەیی کە دەبێ حاکمێکی کورد دابنرێت. لە وەلامی ئەو پرسیارەی کە ئایا ئەو کێ بۆ ئەو پایە هەڵدەبژێرێ؟ گوتی: زۆر پێویستە یەکێک لە بنەماڵەی بابان هەڵبژێردرێت و دابمەزرێت چونکە ئەو بنەماڵەیە کوردی باشوورن و مەلا محەمەد ئەو راستیە باش رەچاو دەکا کە ئەو پایە پیاوی لێوەشاوەی گەرەکە، رای وایە کە دەبێ ئەو حاکمە لە بەریتانیاشەوە پەسەند بکرێت. من بێگومانم کە مەلا محەمەد بیر لە حەمدی بەگی بابان[35] دەکاتەوە. دڵنیام کە ئەو لەم شارەدا پشگیری دەکرێت، پیاوە رووتدارەکان وا دەبینن کە نوێنەرێکی رۆشنبیرە و شایستەی نەتەوەکەیەتی لەگەڵ راوێژکارانی بەریتانیاش بۆ بەرژەوەندی هەموو چینێکی دانیشتوان بە تەبایی کار دەکات. ئەگەرچی شاری کۆیە هیچ پەیوندیان بە شێخ مەحموودەوە نیە بەڵام دانیشتوانی کۆیە (بگوێرەی رای ئەو) وایان لا باشە کە پایە و شوێنی خۆیان لە کوردستان پێش هەموو شتێکی تر وەربگرن. مەلا محەمەد لە پێشڕەوی هەموو هۆشمەند و منەوەردکانی ئەم شارەیە. من دڵنیام هەموو پیاوە ماقولەکانی لەگەڵ رای ئەو دەوەستن، بەڵام خەڵکە گشتیەکە (عامە) وەک مەلا محەمەد خۆی گوتی: بە زۆری بیریان پابەندی نانی رۆژانەی خۆیانن.

---

٣٥- حەمدی بەگی بابان (١٨٧٠ - ١٩٦٠) کوڕی محەمەد رەشید پاشا کوڕی سولەیمان پاشای بابانە، پیاوێکی لێوەشاوە روشنبیری بە توانای دەست رویشتوو بوو. دەرچووی کۆلیجی شاهانە بووە لە ئەستەنبوڵ و لایەنی ئازادیخوازانی گرتووە بۆیە لە سەردەمی سوڵتان عبدولحەمیدی دووەم خراوەتە بەندیخانە. لە جاڕدانی دەستوری ساڵی ١٩٠٨ بەردراوە و بۆتە نوێنەری کۆمەڵەی اتحاد و تەرەقی). لە بەغدا زۆربەی ناودارە کوردەکان لە ماڵی کۆ دەبوونەوە، مولک و سامانێکی زۆری لە شاری حیلە و لە (حارثیە)ی بەغدا هەبوو کە لە باوکی بۆی مابۆوە.. باوکی محەمەد رەشید پاشا پیاوێکی هەڵکەوتەی شکۆدار بووە بۆیە بە (خدێوی پاشا) ناوبراوە. دوو جار بۆتە پارێزگاری حیللە و دواتر هی (منتفک تەعز و دێرە زوور) پاشان بۆتە والیی شاری

## بەڵگەنامەی دووەم

ب- ١- رندل- کابتن کوی- هەروەها نوسراوێکی تر لەم کاپتنەوە بۆ نەفسەری سیاسی لە هەولێر، بە ژمارە (٦٠٠٠)، تێیدا هاتووە:

تەواوکەری نوسراوی سەرەوە ژمارە (٥٠٠٠) لە ١٩٢٠/٣/٧. ئەم نوسینەی ژێرەوە تۆماری چاوپێکەوتنی دوێنێیە کە بۆ جاری دووەم لەگەڵ مەلا محەمەد ئەفەندی و جەمیل ئاغا کرا دەربارەی دوارۆژی بەڕێوەبردنی کوردستانی باشوور. دەمەوێ ئەوەش ڕۆن بکەمەوە کە دوەم گفتوگۆم لەو بەسەدا لە سەر پێشنیازی ئەوانەوە بووە، لە خۆیانەوە ئەم ئاخاوتنەیان پێشکەش کرد.

مەلا محەمەد گوتی: ئەو و جەمیل ئەم بابەتەیان زۆر لا گرنگە و هەردووکیان زۆر بێزاری خۆیان دەربڕی لە هەر ئەگەرێکی گەڕانەوەی وڵاتەکەیان بۆ حوکمی عوسمانی و گوتیان: ئەوان خۆشحاڵن لە شێوازی بەڕێوەبەرایەتی بەریتانیا بۆساڵانی داهاتو.. بەڵام ئەوەشی نیشاندا کە بەرهەڵستکاریەکی بچووک هەیە زۆربەیان لە مووچەخۆرە دەرکراوەکان و بێ کارەکان پێک دێن. لایان وایە کەم کردنەوەی ژمارەی فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتی نیشانەیەکی تەواوە کەوا حوکمی بەریتانیا بە نیازە تێکڕای کوردستان بخاتە سەر بەرژەوەندی خۆی. بۆ ئەوەی ئەو پروپاگەندە زیانبەخشە بەرپێچ بدرێتەوە و بۆ پتەوکردنی بەڕێوەبەرایەتی بەریتانی، مەلا محەمەد و جەمیل ئاغا بە توندی رایان سپارد کە پێویستە حاکمێکی کورد دەستنیشان

---

بەتلیس. حەمدی بەگ لێی رادەدیترا کار و باری سەربەخۆیی کوردستانی پێ بسێردرێ. لە ١٩٢٠ دەچێتە سولەیمانی کە ئەوسا (مێجر سۆن) حاکم بووە، پاشان گەشتێک بە ناوچەی پێنجوین، هەڵەبجە، رانیە و پشدەر دەکا. کە ناهومێد دەبێ لەوەی ئینگلیز ماف بۆ کورد دیار بکەن بە یەکجاری خۆی لە سیاسەت دوور دەخاتەوە. حوکمەت دەست بەسەر زەویەکانی حارسییەدا دەگرێت بۆ شا فەصەل و لەبەرانبەر ئەو زەویانەدا پارەیەکی زۆر کەمی بۆ دەقرسێنن بۆیە پارەکە وەرناگرێت و بە ئاوارەیی لە (لەندەن) سەر دەنێتەوە.

بکرێت و گوتیان: وا پێویسته ئەو دەستنیشانکردنە بە هەڵبژاردن بێت، با ئەفسەرانی سیاسی بەریتانی حاکمی راستەقینە بن بەڵام دەبێ نوێنەری سەرەکی میللەت ئەو حاکمە کوردە بێت و ئەگەر لە هەر کاتێکدا کەمتوانایی لەو حاکمە دەرکەوت، دەبێ بە پیاوێکی لێوەشاوەتر بگۆڕدرێت. ئەوان قایل نەبوون لەسەر حوکمی ویراسی، بەلکو بەگوێرەی توانا بێ. (ئەفسەرە سیاسیەکە دەڵێ): لە مەلا محەدەم پرسی ئایا کێ لەو پایە بەرزە دەوەشێتەوە؟ و هەر وەک من چاوەنۆڕم دەکرد وەلامی دایەوە: حەمدی بەگی بابان کە لەناو کورد لە هەموو کەسێک پتر بۆ ئەو پایە دەگونجێت و بە تواناترە، لە پاڵ ئەو هۆیانەی کە لە نوسراوەکەی پێشومدا (ژمارە ٥٠٠٠) باسم کرد، مەلا محەمەد گوتی:حەمدی بەگ پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندەو ئەگەر پێویستی کرد دەتوانێ بە خۆرای خزمەت بکا.

جەمیل ئاغا گوتی: حەمدی بەگ ئەگەر بەبێ مووچە کار بکا ئەوسا فەرمانبەرانی تریش وەکو ئەو بێ مووچە ئیش دەکەن. مەلا محەمەد گوتی: ئەگەر بریاری دانانی حاکمی یەکەم درا هەڵبەت دانایی لەوەدایە پێشتر رای سەرۆکەکانی تریش وەربگیرێ.. هەروەها لە وەلامی پرسیارێکی مندا کەوا ئایا دەسەلاتی ئەو حاکمە پێشنیارکراوە تا کوێ بێت؟ مەلا محەمەد گوتی: باوەڕی وایە کە پێویستە ئەو پارێزگایانە بگرێتەوە کە دانیشتوانی حەز بکەن، و باوەڕی وایە کە حاکمەکەش لەسەر ئەم خاڵە قایل دەبێت.. پاش ئەوەی ئەفسەری سیاسی دەست نیشانی هەندێک لایەنی ئابووریی کرد، مەلا محەمەد گوتی: بە هەر جۆرێک بێت، بەغدا لە کۆنەوە مەڵبەندی بازرگانی بووە بۆ کوردستانی باشوور و وا دەخوازێ شارەکە هەر لەژێر بەڕێوەبەرایەتی بەریتانیادا بمێنێتەوە. پاشان من لە هەندێک بابەتی رۆتینی دووام، ئینجا پرسیم داخۆ باوەڕیان وایە کە پێویست بەوە دەکا پرس و ڕای رەسمی لەگەڵ هەندێک لایەن و بەرەدا بکرێت و لەگەڵ هەندەکاندا نەکرێت؟ ئەوان گوتیان: وامان پێ خۆشەکە یاداشتنامەیەک بنوسرێت و ئەوان ئامادەن ئەگەر داوایان لێ

بکرێ هەموو شتێک بکەن بە مەرجێک کە نەگەڕێنەوە ژێر نیری عوسمانی.
فەساڵ گران وا لەژێرەوە یاداشتە وەرگێڕاوەکەیانە:

له محەمەد عەبدوڵلا جەلیزادەوە:

محەمەد جەمیل حەوێزی زادە:

بۆ ئەفسەری سیاسی لە کۆیە (٦/٣/١٩٢٠)

لای هەموو کەسێک زانراوە کە بەریتانیای مەزن بەزەیی بە هەموو گەلێکدا دیتەوە ئەوانەی کە مەبەستیان لە خۆپاراستنە. هەروەها پاش جەنگی جیهانی، ئارەزووی حکومەت رووی لە خۆشگوزەرانی و ئارامییە و لە رێی دەزگای حکومەتەوە گەلانی بچووک دەتوانن ژیانی گەشاوەی دابین بکەن و لە چەنگ دەستدرێژی رزگار بن.. گەلی کورد هەمیشە ئارەزویەکی زیندووی بە بیر دادێ کە بە ئازادی شاد بێت، ئیتر جێی داخمانە کە لەبەر ناتەواوی پەیوەندی بەریتانیا بە شێخ مەحمود بەجێ هێنانی ئەم پێشنیارە دووا بخرێ. تا ئێستاش ئومێدی تەواومان هەیە کە رەوشتی دادپەروەرانەی حکومەت بەرژەوەندیمان دەپارێزێت و لە بەدی هێنانی ئاواتماندا یارمەتیمان دەدات و زۆر منەت بار دەبین ئەگەر حاکمێکی بێ لایەنی بەتوانا دابندرێ بۆ ئەوەی گەلی کورد بتوانێ شوێنی خۆی لە نێوان گەلانی پێشکەوتوودا بکاتەوە دەنا بە پێچەوانەی ئەوە، کیانی بچووکی کورد لەناو دەچێ بەڵام ئێمە بە برواوە هەست دەکەین کە بیرو باوەڕی (مبادئ) حکومەتی بەریتانیا لێ ناگەڕێ ئەم تەرزە شتە روو بدات.

پاشان یادداشتی نهێنی بە ژمارە (١س- ٤،١٥٥) لە ١٧ی تەمموز ١٩٢٠ نووسراوە:

لە ئەفسەری سیاسی هەولێرەوە بۆ حاکمی مەدەنی هاتووە کەوا:

کاتی سەردانم بۆ کۆیە دیتم حاڵی شارەکە هێمنە و باری سیاسیش باشە. مەلا محەمەد ئەفەندی حاکمی شەرع و جەمیل ئاغا جێگری حاکمی شارەکە

لەسەر دوارۆژی کوردستان وتوویژیان لەگەڵدا کردم. هی یەکەمیان قسەکەر بوو (مەبەستی مەلا محەمەدە- وەرگێڕ) بڕوام وایە ئەو پایەی هەرە بەرزیان دەنوێنێت و بەگوێرەی بەرژەوەندی بەریتانیاش ئەو لە هەرە باشەکانە و راکانی زۆر جیاوازی نەبوو لەوەی کە لە نامەکەی (رندل) دایە، ژمارە (٦٠٠٠- لە ٧ ئازار) کە لەگەڵ نامەکەی خۆمدا ژمارە (هـ- ١٣٣- لە ئازار ١٩١٠) بۆم ناردن.. ئەو دەستی بە ئاخاوتن کرد، باوەڕی وایە کە ئەندامانی ئەنجومەنی ئاشتی لە پاریس ئەوەندە بێهۆش نین کە ئەم راستیانە نەزانن:

ا- فیکرەی یەکبوونی کوردەکانی باکوور (واتە کوردەکانی تورکیا، وەرگێڕ) لە حکومەتێکی سەربەخۆدا، ئەمە فیکرەیەکی نابەجێیە.

ب- ئەگەر شتێکی چاوەڕوان نەکراویش روویدا و ئەگەر ئەوانە بەراستی حکومەتیان دامەزراند، کوردەکانی کوردستانی باشوور هەرگیز خەونی پێوە نابینن بە یەکبوون لەگەڵ ئەواندا...

هەروەها گوتی: خۆی و ئەو کەسانەی کە بە ناویان دەدوێ سەربەخۆییەکی تەواوی بۆ کوردستان ناخوازن، بەڵکو باوەڕیان وایە کە سەرپەرشتیکردنێکی بەریتانیا لەسەر هەمان شێوەی ئێستا کارێکی پێویستە...

هەردووکیان گلەیی و رقیان لە حکومەتی رووت و رەجالی عوسمانی دەبۆوە کەوا چەوسانەوەی گەلی خستبووە ئەستۆ، ئەوان هیچ حوکمێکی تریان پێ خۆش نەبوو، مەگەر ئێمە کوردەکان ناچار بکەین (ئەم ووتەیە هی ئەفسەری سیاسیە- وەرگێڕ) لەسەر قەبوول کردنی. بەڕای کوردەکان شتێکە کە شایستەی رەچاوکردنە. هەروەها پێویستە هەولێریش رێک بخرێت. من بە مەلا محەمەدم گوت کە دانیشتوانی هەولێر بە توندی بەرهەڵستی ئەوە دەکەن. ئەو رەدی دایەوە و گوتی: ئەوانە شتێکی وا نین چونکە دانیشتوانی ناوچەکە هەموویان کوردن. ئینجا گووتی: کوردستان لەژێر (ئینتیدابی) بەریتانیادا پێویستە لە ژێر حوکمی یەک سەرۆک بێت وەکو (حەمدی بەگ)ی بابان یان هەر پیاوێکی لێوەشاوەی تر. پێویستیشە سولەیمانی مەرکەز بێت یان هەولێر

یاخود هەر شوێنێکی تر کە ئێمە پەسندی بکەین. ئەو وادەبینێ کە رەواندوز بەر هەڵستی (حەمدی بەگ) ناکا مادام ئەو دەسەلاتی ئەوەی نابێ کە دەست نە کاروباریان وەردات چونەکە ئەو سەرۆکێکی رەمزیە. هەروەها لەبارەی داواکارییەکانی بچووکتر مەلا محەممەد داوای دامەزراندنی نیسبەتێکی گەورەتری لە فەرمانبەرانی کورد کرد لە ناوچەکەدا. وا دیارە بەتێکڕایی راکانی مەلا محەممەد رای راستن، ئەگەر پێشنیارەکانی پەسند کرا لەوانەیە هەموو کوردەکان پێ رازی بن.....

شایانی گوتنە کە بەڵگەنامەکە نامەیەکی نهێنی تێدایە ژمارە (ص٢٨٠٧/١- لە ٤/٨/١٩٢٠) لە ئەفسەری سیاسی سلێمانییەوە ئاراستەی حاکمی مەدەنی کراوە و ئەوەی تێدا هاتووە:

بە پێی نوسراوتان ژمارە(٩٠٥١- لە ٢٧/٧/١٩٢٠) داوای لێبوردن دەکەم لە دواکەوتنی وەلامم، ئێستا دانەیەک لە نوسراوی ئەفسەری سیاسیم لە پێشە ژمارە (٤،١٥٥- لە ٢٠/٧/١٩٢٠) کە پشتگیری راکانی ئەفسەری سیاسی هەولێر دەکات.

من لە دەرفەتێکدا رەنگە بە شێوەیەکی سەرپێیی لەگەڵ موفتی هەولێر بدوێم، باوەڕم وایە ئەو لە پشتگیرانی مەلا محەممەدە و خاوەن قسەی خۆیەتی. مەلا محەممەد شتێکی راستی گوت کە توانای یەکگرتنی کوردەکانی باکووری بەدوور خست کاتێک کە گوتی: بە هەر بارێک ئەو یەکگرتنەش ببێ باشوور خەون بە چوونە پاڵیانەوە نابینێ.. ئەوەش راستییەکەیەتی و لە یادداشتەکەمدا (ب- ٢٧٠٧، ١/١)، لام وایە کە منیش هەمان رای مەلا محەممەد ئەفەندیم دەربڕیوە لە بارەی گۆڕانی شێوەی بەڕێوەبەرایەتی ئێستادا بە گەڕانەوە بۆ دواوە دادەندرێت و بەبڕوای من پێشنیارەکانی دەربارەی حەمدی بەگ لەچاو هەموو پێشنیارەکانی دیکە باشترە کە تا ئێستا دراون.. بۆ ئەوەی چەک لە خاوەن پڕوپاگەندەکان دامالێن، من بروام وایە ئێستا یان دواتر هەندێک هەنگاو لەم بابەتەدا پەسند و لە باوە هەرچەندە ئەو پالێوراوە واتە

(حەمدی بەگ) خۆی لە سەرۆکێکی رەمزی زیاتر نابێ، ئەم پایەیە پێویست بە لێ وردبوونەوەیەکی زۆر دەکات چونکە دەبێ ئێمە هەوڵ بدەین ئەم خاڵانە بەدی بێنین:

أ- ئارەزوومان لە دامەزراندنی بەرێوەبەرایەتێکی لێهاتوو..

ب- هەندێک کەس وا دەبینن کە بەرێوەبەرایەتێکی بەردەوام ئەوەیە کە توشی ئاژاوە نەبێت.

ج- شەخسی پاڵێوراوەکە خۆی..

د- چۆنیەتی بەرهەڵستکارەکان لەو بەرێوەبەرایەتیەدا، بەتایبەتی وەک ئەوانەی لە شارەکاندا لە رووی بەرێوەبەرایەتی بەریتانیا رادەوەستن.

من لەگەڵ رایەکانی مەلا محەمەد رێک دەکەوم و ئەگەر ئێمە راستبین و راستگۆبین دەبێ لایەنەکانی ئەتنی و ئەنتنۆگرافی (واتە زانستی رەگەزناسیی مرۆڤی) لەسەر دانیشتوان پەیرەو بکەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەندێک ناوچەی تر بخرێتە سەر ئەو بەرێوەبەرایەتیە. لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر ئەم پلانە پەسند کرا، ئەوسا دەبێ بزانین کە کارێکی عەمەلی نیە کوردەکانی دزەیی بخرێنە سەر، بەڵام دەکرێ شوێنی دیکە لە ناوچەکانی تردا وەکو ناوچەی (شوان) بخرێتە سەر ئەو بەرێوەبەرایەتیە. لەوانەیە بێمەوە سەر ئەم باسە بەڵام پێویست نیە ئێستا بەدرێژی لەسەری بڕۆم.

# مەلای گەورە و شێخەکان

بۆ راستی دەبێ ئەوە بڵێین کە مەبەستی مەلای گەورە لە بەربەرەکانێی شێخەکان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی نەبووە بەڵکو لە بیروبڕوایەکی پتەوی پڕ زانیاری نەتەوە پەرستی کوردایەتی بووە بۆ نەهێشتنی خورافات و بیری چەوت و زیان بەخش. ئەو سەیری ئاسۆی بەرفراوانی چارەنووسی کوردی کردووە. ئەم هەستەش لە دڵیدا بە قووڵی جێگیر بووە کەوا دیاردەی دەروێشی و شێخ پەرستی شتێکی ترسناکە و هەرگیز لەگەڵ ئامانجی دوارۆژی گەلی کوردی هەژار ناگونجێت چونکە شێخەکان لەو هات و بات و گێرەشێوێنیەی خەڵکی کوردەواری تەنیا پایە و دەسەڵاتی خۆیان رەچاو کردووە دژی خوێندەواری و رۆشنبیری و پێشکەوتن و دژی هەر جوڵانەوەیەکی ئازادیخوازی.

وەک باسمان کرد جەلیزادە مەلایەکی ئاسایی نەبووە کە دوعاخوێنی نێو مزگەوت بێت و گوێ نەداتە باری کۆمەڵایەتیی خەڵکی رەش و رووت، بەڵکو وەک حاجی قادری شۆڕشگێڕ هەمیشە بیری لەوە کردۆتەوە چۆن بتوانێ نەتەوەکەی بەرەو دنیای گەشی ئازادی و سەرفرازی ببات و خەونی بەوەوە دیووە داخۆ کەی دەبێ کوردیش وەک گەلانی تری جیهان لە خەو راپەڕن و ئازاد و بەختەوەر بن و لە کۆت و ستەم و ژیانی ژێردەستی و چەوسانەوە رزگار بن. جا لە پێناوی ئەو ئاواتە بەرز و پیرۆزەوەدا تووشی گەلێ کێشە و ناکۆکی و ململانێ هاتووە.

مەلا سدیق ی مەلا سالح کە خەڵکی تەقتەقە بوی گێرامەوە گوتی: رۆژێک مەلا تەهای بالیسانی کە ئەوسا یەکێک بووە لە مریدە دڵسۆزەکانی شێخ عەلائەددینی بیارە، هاتە مزگەوتی (مەلا جامی) لە کۆیە. میوانی مەلا سادقی مەلا ئەحمەد بوو و پێش نانی نیوەڕۆ رووی لە مەلا سادق کرد، گوتی: حەز دەکەم شتێکی وا بکەیت چاومان بە مەلای گەورە بکەوێت.. مەلا سادقیش گوتی خێرە بۆچی دەچیە لای؟ گوتی: بە نیازی شەڕ کردن دەچم

پایەی شێخ و مەلای لەگەڵ یەکلا بکەمەوە.. مەلا سادق گوتی: گەر بەقسە و ڕای من دەکەیت خۆت تووشی مەلای گەورە ناکەیت، توانا و دەسەڵاتی ئەوت نیە، پیاوی باش بە.. گوتی منیش وەک ئەو مەلام مەیدان مەیدانی حەدیس و ئایەتە، تۆ هەقت نەبێ، لەمن مەترسە و دەشم بینی..

مەلا سادق زۆر هەوڵی لەگەڵ دا بەڵام کەڵکی نەبوو و ناچار بۆ ئەم مەبەستە نامەیەکی بە فەقێیەکی خۆیدا نارد. مەلای گورەش لەژێر هەمان نووسراودا رایگەیاند کە پاش نوێژی عەسرێ بفەرموونە دیوەخان. لە کاتی دیاریکراودا من و مەلا تەها و مەلا سادق هەرسێ چوینە خزمەتی، زۆری ڕێزلیناین و چەند جارێک دووپاتی بەخێرهاتنی لێ کردین، مەلا تەهاش هاتە قسە و گوتی: مامۆستا هەندەمان بەخێرهاتن لێ مەکە چونکە من بۆ شەڕ هاتووم.. مەلای گەورەش زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی:

- جا مەلا پیاو لەماڵی خۆی شەڕێ دەکا؟

- بەڵێ قوربان من هەر بۆ ئەوە هاتووم.

جەلیزادە لەسەرخۆ پێی گوت: دەکرێ بزانم شەڕی تۆ لەسەر چیە؟

- قوربان لەم دوواییادا لە خەڵکیم بیستووە کە جەنابت بە شیعر هەجووی شێخ و مەشایەخت کردووە!! هەرچەندە بڕواش ناکەم، ئەم تەرزە شتە لە ئێوە ناوەشێتەوە.

مەلای گەورە کە گوێی لەو قسەیە بوو قومێکی درێژی لە جگەرەکەی دا، باری دانیشتنی گۆڕا، دەم و چاوی سوور هەڵگەڕا و تەواو روخساری تێک چوو. پاش کەمێک بێ دەنگی رووی تێ کرد و گوتی: فەقێ تەها ئایا تۆ قورئانت خوێندووە؟

ئیتر مەلای گەورە کەوتە گیانی وەک کانیە ئاوێکی پڕ شەپۆل لێی دەربۆوە، پەیتا پەیتا شێوەی بارانی بەهار ئایەت و حەدیسی بەسەردا باراند، لەوێشەوە هاتە سەر گوتەکانی ئیمامی حەنەفی و شافعی و هەمووشی لەبەر بوو، سەیری هیچ کتێبێکی نەدەکرد.. مەلا تەها کە گوێی لەو هەموو ئایەت و

فەرمووده و بەڵگە و فەساحەت و ڕەوانبێژیە گرت بە دەنگی کاریگەری مەلای گەورە، بەجارێک حەپەسا ، یەک قسەی پێ نەکرا و هەرچی لەوێش دانیشتبوون دەنگ و جوڵەیان لێ بڕا، کەس زاتی ئەوەی نەکرد نوقەی لێوە بێت. کە هەڵستاین، مەلای گەورە تا دەرگای دەرەوە بۆ بەڕێکردنمان هات، مەلا تەها ئاوڕێکی بۆ پشتەخۆی دایەوە پاشان بە هەردووک دەست ردێنەکەی خۆی گرت و گوتی: تف لەو ردێنە، توخوا ئێمەش مەلاین توخوا ئێوەش سەرو تفێکی لێ بکەن.. مەلا سادقیش گوتی: مەلا پێم نەگوتی؟

سەردەمێک دەروێش و سۆفی هەقە لە دەوروبەری کۆیە پەیدا ببوون شەو تا بەیانی خەریکی های و هۆیی و دەف لێدان دەبوون، لە جیاتی ئەوەی بیر لە دووا کەوتویی و پەرێشانی خۆیان بکەنەوە کەوتبوونە گێژاوی سەر لێ شێوانی حایی و حۆیی و هەرا و هەڵپەی دەروێشایەتی. جا دەبێ جەلیزادە لەو بارودۆخەدا چ هەڵوێستێک بنوێنێت؟ ئەگەر بێ دەنگ بوەستێ، ئەوسا ئەو تەرزە بیروباوەڕە پووچە وەک نەخۆشیەکی کوشندە پەرەبستێنێ و بکەوێتە گیانی نەتەوەکەی. بێگومان مەلای گەورە کە خاوەنی هەست و هۆشێکی پڕ سۆزی کورد و کوردستان بووە نەیتوانیوە چاوپۆشیان لێ بکات. لێیان هاتە مەیدانی خەبات وەک کێوی سەختی سەرکەش روو بەڕوویان وەستا و لە پێناو ئەوەشدا گیانی خۆشی خستۆتە مەترسییەوە. جەلیزادە لەم بارەیەوە بەسەرهاتێک[٣٦] دەگێڕێتەوە دەڵێ:

سەر لە بەیانی زستانێکی سارد لە سەر حەوزی مزگەوت دەستنوێژم تازە دەکردەوە، کتوپڕ دێوانەیەک وەک غوول لێم پەیدا بوو کوتەکێکی سەرخریشی لە پشت خۆیەوە گرتبوو گوتی: مەلا تۆ گوتوتە پێغەمبەر لە حەزرەتی غەوس گەورەترە؟ لەو دەمەدا کەس دیار نەبوو، تەنیا بووم، ناچار تا توانیم بە دەنگی بەرز وەڵامم دایەوە گوتم: لە کێت بیستووە؟ جا چۆن باوەڕدەکەیت؟ خۆ لە منت نەبیستووە؟ تا فەقێیەکان بە دەنگمەوە هاتن منیان رزگار کرد و ئەویشیان لە

٣٦- دیوانی مەلای گەورە - چاپی کوردستان.

حەوزی ئاوە ساردەکە مەلەپێ کرد!!

جا وەک گوتمان بەرەنگاریی دژ بە شێخەکان بۆ بەرژەوەند و ئارەزووی تایبەتی خۆی یان لە رووی رقایەتی و ناحەزیی نەهاتووە چونکە سەیر دەکەین دۆستایەتی لەگەڵ چەند شێخێکی زانا و بەرێز و ناوداری سەردەمی خۆی هەبووە بەتایبەتی لەگەڵ شێخ تاهیری (هەلەجە) تێکەڵاوی خزمایەتی و هاموشۆیەکی بەردەوامی برایانەیان لە نێواندا هەبووە. هەروەها حاجی مەلا عەبدوڵای باوکیشی زۆر دۆستی کاکە ئەحمەدی شێخ بووە و نامەیان لەگەڵ یەکدا هەبووە و بە هەمان شێوە لەگەڵ شێخ عەلی تاڵەبانی.. پێویستە بگوترێ کە ئیمرۆ گەلێک گەنجی رۆشنبیر و نەتەوە پەروەر لە بنەماڵەی شێخەکان هەڵکەوتوون و بە گیان و دڵ خزمەتی نەتەوەی کورد دەکەن و لەسەر بیرو رای مەلای گەورەن کە هەر زانیاری و زانستە گرەوی سەرکەوتن و پێشکەوتن دەباتەوە. دڵنیاشم ئەوانش دەسەلمێنن کە زەرگ و نوشتە و کوشتەک و حای و حووی دەروێشان هۆی و ماڵوێرانیی نەتەوەی کوردە.

# مەلای گەورەو
# جەژنی نەورۆز

ئەوەی ئەمڕۆ دەزانن کە نەورۆز نیشانەی سەربەرزی و نەبەردی و سەروەری نەتەوەی کوردە، جەژنێکە لە دێرین زەمانەوە ئەوە لەدووای ئەوە هەموو ساڵێک بە شانازیەوە یادی کردۆتەوە. کورد بە جەژنێکی راستەقینە و پیرۆزی زانیوە، ئاهەنگ و زەماوەندی بۆ گێڕاوە. جا ئەوەش ئەگەر لەوە هاتبێ کە کاوەی دلێر بە شۆڕشێک هەستابێ تاج و تەختی زوحاکی زۆرداری سەرەوە ژێر کردبێ، یان ئەگەر نەورۆز پێشتریش هەر هەبووبێت و بەرگی جاویدانی و نەمری پۆشیبێت، پاش داهاتنی ئیسلامیش نەورۆز هەر کراوە بە جەژن و بە چاوی پڕ لە رێز و پیرۆزیەوە سەیر کراوە. مەبەستم لێرەدا ئەوە نیە باس و بەسەرهاتی نەورۆز لە رووی مێژوویەوە بکەم چونکە زۆر لە نوسەر و ئەدیبان لێی دواون و لێکۆڵینەودیان لەسەر کردووە. تەنیا نیازم لێرەدا ئەوەیە هەندێک رووداو و هەڵوێستی ناحەز و کۆنەپەرستانەی هەندێک کورد دیار بخەم کە تا ئەم دووایەش بەربەرەکانەی نەورۆزیان کردووە دژی وەستاون و بە چاوی گومان و ئاگرپەرستی سەیریان کردووە. با دوور نەڕۆین، لە چل و پەنجاکاندا نەک هەر مەلا و شێخ و حاجی بەلای نەورۆزەوە نەدەبووایە بچن بەڵکو بازرگان و کاسبکاریش بە شتێکی نابەجێ و گوناحیان داناوە.. دێتەوە یادم لە چلەکاندا بە بۆنەی نەورۆزەوە کۆمەڵە قوتابیەکی هەرزەکار بە سەرپەرشتی هەندێک رۆشنبیری کورد بە نهێنی چووین لە قۆنگرێ[37] بەرامبەر باغەکانی ئۆمەرخوچان چای و هەندێک خواردەمەنیمان برد لەنێو مێرگ و گۆڕێکی سەوز لە دەورەی ئاگرێکی مەشخەڵ بەرز دەستمان بە شایی شێخانی و هەڵپەڕکێ کرد لەگەڵ ئاوازی پڕ سۆزی گۆرانی نەورۆز و هەندێک سروودی نیشتمانی. تا نزیک ئێوارە ئاهەنگی نەورۆزی خنجیلانەمان بردە سەر و بە هەستی پڕ شانازی و خوێنی گەرمیی لاویەتی بەرەو شار بوینەوە. ئەوەشمان لای کەس و کارمانەوە نەدرکاند. دوای ئەوەش ساڵی

---

٣٧- قۆنگر: کۆمەڵە تاوێرە بەردێکی شاخاوییە لە شوێنێکی بەرزە دەنوڕێتە باغەکانی ئۆمەر خوچان لە کۆیە.

١٩٤٨ ئەوسـا قـوتابی خـوێندنگای مـامـۆسـتـایان بووم لە هەولێر لە لایەن پارتە نیشتیمانییەکانەوە بڕیاری سازدانی ئاهەنگی نەورۆزیان دا، دەرەنجامی بڵاوبونەوەی ئەو بڕیارە هەولێر بەجارێک خرۆشا و هەر خوێندکـار و لاوی کوردپەروەر بوو وەک هەنگ لە هات و چۆ و گەرمەی کاردا بوو. لە لایەکی تریشەوە بەردیەک لە پیـاوانی ئاینیی کـۆنەپەرست پێک هاتبوو کـەوتنە بەربەرەکانی و خۆ ئامـادەکردن بۆ پووچەڵ کـردنی ئاهەنگی نەورۆز جـا هەر دەرویش بوو بە خـۆی و دەف و زەرگ و شـیـرەوە دەیپـرمـاند و دەینەڕاند. کـار لەوەدا نەما و هەردووک لا کەوتنە خۆیان تا توانیـان لایەنگر و هاوبیـری خۆیان هێنـایە مـەیدان روو بەڕووی یەکـتـر بووین. بەرەکـەتدا دزدییەکان کاری مەردانەیان نیشـان دا، زۆربەی کوڕی ئازا و قوتابی و خوێندەواریان بەخۆیان و خەڵکی دێیەکانیانەوە ووڕوژانە ناو شار. ئەوەش ئێمەی پشت ئەستوور و وردبەرز کرد. کاتێک میری سەیری کرد مەسەلەکە گران دەودستێت بڕیاری دا لێی بگەڕێن نەورۆز لە دووری شاردا بکرێت. شوێنی ئۆردووگای ئێسـتـایان بۆ تەرخان کرد، هێزێکی زۆری پۆلیسش بۆ پارێزگاری و ئاسایش داندرا. ئیتر بەشداربوەکان کە زۆربەیان گەنجی نیشـتـیمان پەروەر و خوێندکاری هۆشمەند بوون بە شێوەی ئەڵقە ئاهەنگی جـەژنی نەورۆزی پڕ شـانازیمان سـازدا.. جـا دەتوانم بڵـێم یادکـردنەوەی جەژنی نەورۆز ببوە بەشێک لە تێکۆشان و خەباتی سیاسی گشت رۆشنبیر و رۆڵەی هۆشـیـاری ئەوسـای کـورد، بەربەرەکـانێ و بەرەنگاربوونی بەردەوامـیـان دژ بە پروپاگـاندە و رای چەوتی ناحەزانی نەورۆز بوو، و لە ئەنجامی ئەو هەوڵ و تەقـەلا سەختـەدا بوو نەورۆز، ئەم شێوە گشتیـەی ئێستای بە خۆیەوە گرت و خۆی سـەپاند کەوا جەژنێکی راستەقینەی هەموو کوردێکە.

با وەچەی ئێـسـتـامـان رادەی بە جەرگی و نەبەردی هەڵوێستی مەلایەکی ئاینی عـەمـامـە بەسـەر رەچاو بکات و، بە بار و تەرازووی ئەوسا بزانێ کە مـەلای گەورە چەند بیر فراوان و گیـان شۆڕشگێڕانە بـووە و چۆن دلێرانە لەو کاتەدا هـاتۆتە مەیدان و پەردەی تـەمـاوی لەسـەر پاک روخـسـاری نەورۆز لاداوە. گـوێی نەداوەتە تـانەو توانجی کـۆلکە مـەلا و پیـاوانی نەفـام، بە بۆنەی نەورۆزەوە روو بەڕووی خـەڵک و حەشاماتی شاری کۆیە راوەستـاوە. ئەم ووتارە جوانەی سـاڵی ١٩٣٨ لە بەر دەرکی سەرای کۆیە خوێندەوە.

# دەقی گوتارەکەی مەلای گەورە
# لەسەر نەورۆز

ئەمڕۆ رۆژێکە پڕ نوور، دونیا مالە مالە لەسرور، ژاڵە دەدردوشێتەوە لالە دەگەشێتەوە دار و درەخت دەپشکون، بەرو سەمر دەردەکەون فەلەک وەک خێودتی زبر جەدی هەڵدراوە، زەمین کەوای ئەتڵەسی سەبزی گوڵگوڵاوی لەبەر کرا، ئافتابی عالەم درەخشانە، خورشیدی خاوەر بە ئەشیعەی زەهەبی زەڕ ئەفشانە، نزیکە بڵێم ئەرز و سەما کەوتیتە رەقس و سەما، ئەمە چ باس و خواسە چ ئەسەرە چ خەبەرە؟

بەڵێ بەڵێ ئەمڕۆ رۆژی مرادە، نەورۆزی گەلە، حەقە رۆژی زۆر موبارەکە، ئەودڵی بەهارە، یەکی ئیعتدالی لەیل و نەهارە، جەژنە جەژنی ئۆمەتە، جەژنی مەحەبەت و ئولفەتە.

**دووشەممە ٢١ ئازار ١٩٣٨**

# جەلیزادەی زاناو ئەدیب

وەک گوتمان مەلای گەورە تا ساڵی ١٩٢٨ بە قازیەتی مایەوە، پاش ئەو مێژوە بە یەکجاری لە کار و فەرمانی میری دوورکەوتۆتەوە و هەموو کاتی خۆی بە دانانی کتێب و خوێندنەوە و شیعر و دەرس گوتنەوە بەسەر بردووە بە رادەیەک کە لە شەو و رۆژێکدا ١٦ سەعات خەریک بووە. جەلیزادە هەرچەندە لە زووەوە ناوبانگی زانیاری پەرەی سەند و بە مەلایەکی گەورە و نیشتمان پەروەرێکی دڵسۆز لە هەموو کوردستاندا بڵاو ببۆوە بەڵام لە ساڵی ١٩٣٠ بە تەواوی گەیشتە پایەی فەیلەسوف و زانایەکی بێ مانەندەوە و بەری کۆششی چل ساڵەی ژیانی لەو مێژووەوە بەجارێک هاتە بەر و هەمو سنوورێکی تێپەڕاند. ئەگەر بێتو کتێبەکانی کوردی و عەرەبی چاپ بکرێن لە ٢٠ هەزار لاپەڕە کەمتر نابن. بە زمانی عەرەبی ئەم کتێبانەی داناوە:

* المصقول في علم الاصول.
* الكلام الجديد.
* القائد في العقائد.
* ابهى المأرب في اثبات الجوانب.
* كشف الاستار في مسألة الاختيار.
* الالة و الطبيعة والعقل والنبوة.
* ضياعان عظيمان.
* المشاهد على طراز المقاصد والموافق.
* رسالة في حقيقة الاسلام واخرى في حقيقة الايمان.
* المعجزات والكرامات.
* الاشخاص الستة.
* الحدس سلم الارتقاء.
* غايتي واملي في علمي وعملي.

بەڵام جێی داخە کە لەو هەموو کتێب و بەرهەمە زۆرانە بەشێکی کەمیان لە چاپ دراون.. بەرهەمەکانی بە زمانی کوردی ئەمانەن:

١- دیاری مەلا محەمەد (دیوانێکی شیعرە لەبەشی (جەلیزادەی شاعیر) لێی دواوین).
٢- عەقیدەی ئیسلام.
٣- موجەدید- نوێ کەرەوە.
٤- هەر سێ بەشەکانی قورئان لەژێر ناوی « تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی». بەشی یەکەمی لە ساڵی ١٩٦٨ لە ١٦٤ لاپەڕەدا لە لایەن نەجیبە خانی کچی لە چاپ دراوە و بەشی دووەم لە ساڵی ١٩٧١ لە (٢٧٧) لاپەڕەدا هەر لە لایەن خوشکی ناوبراودا چاپ کراوە.

جا ئەگەر بمانەوێ پایەی مەلای گەورە لە بارەی ئاینی ئیسلامدا بزانین دەبێ هەر یەک لەم بەرهەم و کتێبانەی کە باسمان کرد لە لایەن شارەزایانەوە هەڵسەنگێندرێن و لێکۆڵینەوەیەکی فراوانیان بۆ بکرێ چونکە وەک گوتمان نابێ جەلیزادە تەنیا بە چاوی شاعیرێک سەیر بکرێت بەڵکو دەبێ ئەوە بزانین مەلای گەورە لە زانا هەرە بەرزەکانی ئاینی ئیسلام دەژمێردرێت و لەبارەی فەلسەفە و شەرع و تەفسیر و فیقە (زانستی دینی) و خاوەنی رای تایبەتی خۆی بووە و لە رێرەوی چاولێکەرەیدا نەرۆیشتووە، جێگەی راستەقینەی خۆی بەنیسبەت کۆن و نوێ و سەردەمی خۆیەوە دەست نیشان دەکرێ. لە یەک لە دۆستانی مەلای گەورەم بیستوە گوتوویەتی: خۆزیا من و (جەمالەدینی ئەفغانی و محەمەد عەبدە) قەدەر کۆی کردباینەوە تا پێکرا دەستووری ئاینی ئیسلامیمان بە شێوە راست و پاک و پیرۆزەکەیەوە دارشتبایە و لە ناو موسڵمانان بڵاومان کردبایەوە.. جا بە پێی هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی مەلای گەورە دەتوانین نرخی راستەقینە دەدرێ بەو زانا مەزنە کوردەوە. بێگومان ئەم کارەش دەکەوێتە ئەستۆی شارەزایانی سەر بە قوتابخانەی ئاینی.

جەلیزادە لە ١٩٤٣/٢/٢٣ ئەم نووسەراوە عەرەبیەی لەسەر شێوەی مەقاماتی (بدیع الزمان) و (حریری) داناوە.

## كل مافي الكون

كل مافي الكون وهم او خيال او معكوس فى المرايا او الظلال، ادى بي الخيال وسار بي الى الاودية والتلال والسهول والحقول والغابات والبحيرات والجبال، فاذا انا قبالة جبل يتلألأ منه النور، الا وهو جبل الطور، طور سيناء، جبل التجلى والثناء والسناء، فاخذتنى صعقة كصعقة موسى اذ تجلى ربه للجبل فجعله دكا دكا. فلما افقت قلت سبحان الله العظيم كانى ارى طيف سيدنا موسى الكليم يصعد الجبل لميقات ربه المعلوم وكان ثلاثين ليلة ويقول سبحانه و اتممناه بعشر، فتم الميقات اربعين ليلة فتذكرت امرا غريبا وشيئا عجيبا اذ الشيء بالشيء يذكر، مرتبى من السكر فى كل شهر على عدد ميقاته الاصلى فهل فى الامكان ان يتم بعشر. والتجأت من اليد البيضاء ان يذكر حالي وما خطر ببالي عند خالق البشر وجاعل السكر من القصب والجودر وبعد تامل وتفكر وتحير، ناداني الضمير: اذهب الى قايمقام بلدك السيد محمد البشير[٣٨] فان عشرة كيلوات عنده يسير وانه على ذلك بلا شك لقدير.. نزل فى قلبي هذا الايحاء كانه منّ السماء، اوحلوى السكر يصنع فى الموصل الحدباء، فعندما اتاهب لاذهب اليه واعرض حالي عليه وابين لجنابه المغوار وانا اعتدنا شرب الشاى اناء الليل واطراف النهار، فاربعين كيلوا يكفينا بنوع من الاقتصاد وشئ من الشح مع الضيوف والزوار الامجاد. فاذا بناد ينادي ان السكر يوزع على النفوس سواء فى ذلك الشريف والوضيع والعاكف والباد. فاسكرنى النداء، يا اله السماء ما هذا النداء المنحوس والامل المعكوس، فمرتبى يتنزل الى خمسة عشر كيلوا والنصف حسب دفتر النفوس، فما التدبير، الا هي الدبير. بينما انا والهان وحيران فاذا بدا لي اصوات رسل يتهيون وعلى النظم العسكرى يمشون ويقولون فى ذلك البيداء: الحنطة الحنطة الحنطة.. فقلت ماهذه البلوى، اليس الله انزل عليهم المن والسلوى، فلا من لديهم ولا سلوى، يريدون زيادة على هذه النعمة العظمى فى هذا القفر، ما تخرج

---

٣٨- محمد البشیر: ئەوسا قایمەقامی کۆیە بووە.

لهم ارض مصر من الفوم والقثاء والعدس والبصل وغيرها من الحبوبات المقدسة في ذلك العصر. انهم لفى خسر، اما علموا مانحن فيه من العسر، لا حنطة ولا شعير ولا عدس ولا بصل ولا دبس ولا عسل، لا لحم ولا دمص ولا حمص ولا دخن ولا الى ماشاء الله ونيران الحرب لاتزال تلتهب بشره(٣٩) فى الغرب. معيشة الشرق الشقي والحشرات الفتاكات للزرع فهناك الحرث والنسل والزرع والضرع ومع كل هذا فنحن في وقار واصطبار، لا نتزعزع انما نتضرع الى الله ان يرحم الضعفاء ويفرج عن الفقراء وان يطفيء نار الحرب ويمن بالامن والامان والسعة والدعة والراحة على الشرق والغرب ويجعل من عامنا هذا في كل حبة سبع سنابل وفي كل سنبلة مائة حبة، و يضاعف لعباده انه رؤوف رحيم، جواد كريم. فقال قائل منهم: لاتضحكوا منا ولاتفتخروا علينا، لكم ملاذ و ملجا و عباد، حكومة ساهرة، فوجوهكم ناضرة الى الاء الحكومة ناضرة هذا متصرف لواء اربيل السيد النبيه النبيل الساعي لدفع الكروب محبوب القلوب الا وهو مصطفى من ال يعقوب وهذا قايمقام بلدك الاديب الدبير الممتاز بحسن الادارة و صائب التفكير افلا يكفيكم انه البشير، لعمري انه جدير بالثناء و التقدير، يرحم الصغير و يوقرالكبير. يتجاهد لاطعام البائس الفقير فقلت: نعم نعم صدقت و بالحق نطقت، لكن اذهب الى حضرته وحدي ام مع الذين نصيبهم عندي.. فتوجهت الى مقامه الكريم، مقتديا بسيدنا الكليم، سلام قولا من رب رحيم، فحياني احسن تحية و قابلنى بغاية الاحترام و التجلة فعرضت له حالي و مابدا لي في خيالي، فقلت: و انا جليزادة، اطلب منك الاصل والزيادة.. فقال: اما الزيادة فمستحيلة و اما الاصل فيحتاج الى شيء من الحيلة، وقد قال خالق الصورة و الهولى لسيدنا موسى خذها ولا تخف سنعيدها سيرتها الاولى فشكرته على ذلك جزيل الاحسان و قلت: فليكن نصيبى من السكر كالايمان عند ابى حنيفة النعمان، لا يقبل الزيادة و النقصان.. فرجعت الى اهلي و انا مستبشر فرحان لا كرجوع موسى الى قومه وهو غضبان والله المستعان و عليه التكلان.

---

٣٩- مەبەستی جەنگی جیهانیی دووەمە ١٩٣٩-١٩٤٥.

ئەمەش لەبەرهەمە ئەدەبیە بەهادارەکانی جەلیزادەیە رۆلەو نەوەی ئەمرۆش دەتوانێ سودی لێی وەربگرێ تا چەواشەی بیرورای چەوتی خەرافات نەبن.

## فڕی فڕی قەل فڕی(٤٠)

ئینسان بە گەورەیی ئەگەر ئەحوالّی مندالّی لە یاد بێ قیاس لە حالّەتی گەورەیی بکات، فەرقێکی زۆر سەیر دەبینێ. گەر بەچاوی دلّ تەماشا بکات دەزانێ ئەو فکرەی کە لە ئەساسی مندالّی هەیبوو زۆر پاک و زۆر چاک بوو، ئەمما بە تەربییەی باوک و دایک و سائیری قەوم و قیلە، فیکری فیتری (فطری)(٤١) لێ گۆڕا.

لە یادمە بە مندالّی گەمەمان دەکرد (فڕی فڕی قەل فڕی) چەند مندالّێ دەورەمان لێک دەدا، یەکێک ناوی چەند تەیرێکی دەهێنا، لەگەلّ ناوەکە مندالّەکان دەستیان بەرز دەکردەوە. لەو میانە ناوی چشتەکی هاتبا کە نەفڕی، ئەوەی دەستی هەلّبڕیبا تێدەکەوت. ناوی ئەم چشتە نەختەک وێچو بوو لەگەلّ ناوی تەیرەکی بۆیە ئەو مندالّی کەمی لەبەریا لێ تێکدەچوو. مەسەلا دەیگوت (فڕی فڕی کەو فڕی)، (فڕی فڕی کۆتر فڕی)، (فڕی فڕی کۆتک فڕی) ئەوەی دەستی بلّند کردبا تێدەکەوت، مندالّەکان پێی پێدەکەنین و گەپیان پێ دەکرد.. (فڕی فڕی قازی بازی فڕی)، (فڕی فڕی قاز فڕی)، (فڕی فڕی قاضی فڕی). یەکێ تێ دەکەوت، چەپلّەیان بۆ لێ دەدا و قەشمەریان پێ دەکرد.

هەروەها ئەو مندالآنە بە فکری فیترِیی خۆیان فەرق و تەمییزێکی باشیان هەبوو، چی دەفڕێ، چی نافڕێ، چۆن دەفڕێ، بە چی دەفڕێ، بە چاکی دەیانزانی، ئەمما لەپاش گەورەبوون فیکر و هۆشی قەوم وەرگرتن دەبینین

---

٤٠- ئەم دەقە دەقی ئەسلّیی نووسینەکەی مەلای گەورەیە کە بە شێوازی ئەو سەردەمەی خۆی تۆماری کردووە. گەنجەکان دەتوانن بەراوردی لەگەلّ شێوازی هاوچەرخدا بکەن.

٤١- واتە زگماکی، سروشتی.

فەرقێکی گەورە هەیە بە جارێ ئیش سەرەوبن بووە. ئیمان بە کەرامەت فکری فیترِی بە تەواوی گۆڕیوە، مەسەلا بە هیمەتی شێخی (فرِی فرِی کەر فرِی) دەبێ دەس بەرزکەی. (فرِی فرِی شێخ بۆخۆی فرِی) دەست بەرزکە، هەی هاوار بۆ خاتری خوا بۆ خاتری پێغەمبەر چۆن دەست بلّند بکەم؟! ئەو کەرە گوێ درێژە، ئەو شێخە سەر زلەی ورگ پانەی مل ئەستورە چۆن دەفرِێ؟! ئیتر خانە وێران، تۆ ئیمانت نیە، کافری، زەندیقی، لە دین دەرچوویی، نازانی شێخ خۆشەویستی خودایە؟ ئەمە کەرامەتی ئەولیایە، تۆ نەتبیستووە لە مەلایانی موتەبەحیر کە کەرامەتی ئەولیا حەقە، ئەوی لە خوا بخوازی بۆی دەکات، دەست هەلّبرِە! برام لازم ناکات ئەوی خۆشەویستی خودای بی بفرِێ فرِین قاعیدەی هەیە (پێغەمبەر، ابوبکر، عمر، عوسمان، علی) خۆشەویستی خودا بوون و نەفرِین چۆلەکە دەفرِی خۆشەویستی خوداش نیە، کورِە مالّ رماو ئەوە چشتەکی ترە وەرە ئیمان بێنە دەنا شێخ غەزەبت لێدەگری خوا لێت خۆش نابی، پێغەمبەر شەفاعەتت بۆ ناکا خولاسە بە سەد فرِوفێلّ و دەسیسە مندالّەکە وەردەگێرِن لەسەر فکری فیترِی لای دەدەن (دیسان فرِی فرِی تەیارەی ئینگلیزی فرِی) هاتە سەر شاری کۆیە بۆم بەردومان دەکات مندالّە پاکەکە خێرا دەست هەلّ دەبرِی گەورەکان دەست هەلّ نابرِن.

مندالّەکە: بۆ دەست هەلّنابرِن؟

گەورەکان: بۆ کورِە چ حەدی هەیە تەیارە چیە چۆن دەفرِی ئەوان کافرن خۆ شێخ و ئەولییا نین بفرِن..

مندالّەکە: وەرن بۆ خاتری خوا دەست هەلّبرِن وە ئیلا زەرەر دەکەن بەخوا ئەوا هات گرِەی دی[٤٢] بۆمبای زۆر پێیە بۆمبایەکتان پێدابدا بەبەر بکەون هەموو پارچە پارچە دەبن.

گەورەکان: برِۆ مندالّی نەفام تەماتە هەلّمان بخەلّەتێنێ تا تێ بکەوین پێمان پێبکەنی.

---

٤٢- لەسالّی ١٩٢٢م ئینگلیزەکان کۆیەیان بۆمب باران کرد بۆ ماوەی (٧) رۆژ.

منداڵەکە: بە خودای مەقسەدم ئەوە نییە بۆ ئێوەمە حەیف دەکەم ئێوە بفەوتێن ها ها بەخوا ئەوا هات، کورەکە راست دەکات تەقی بۆمبا لەبەر دەرکی قشلەی تەقی عاردی لەرزاند دەنگی زۆر بە قووەتی هەر وەخت بوو پەردەی گوێم بدڕێ ئەمما مەترسێن شێخ ناهێڵێ بە هیممەت زەرەر مان بێت.

منداڵەکە: خۆتان بشارنەوە... پێدەکەنی... ئەوە ئیشی شێخو مێخ نییە، ئەها ئەها بڕۆن ئەوا شخ هەڵدێ... تەقەیەکی دی شێخ هەڵات ئەها ئەها ئەوجا فڕی لەترسان باڵی گرت... ئەها ئەها ئەوا غاری دا بۆ کونێ، خۆی شاردەوە ئەوەتا چووە ئەشکەوتێ چووە بنە بانێ!!

گەورەکان: وەی ماڵی وێرانم خۆ شێخ هەڵات خۆی شاردەوە دەک خانەت خراپ بێ ئەدی لە زەل زەلەی قیامەت لە سایەقەی ئینشیقاقی سەماوات لە شەهیق و زەفیری جەهەندەم کوو نەجاتمان دەدا؟ ئەیش ئەیش: پەکو چۆن عەقڵی لێ گۆڕین بە درۆو دەلەسە کوو ماڵی خواردین بەهیمەت نەهیمەت بێ (تەق تەق.. تەق تەق.. بۆمبا باری) جێی قسە نەما هەڕاکە چارەسەرە ڕۆژی نەفسی نەفسییە (فڕی فڕی شێخ فڕی ، فڕی فڕی مەلا فڕی ، فڕی فڕی ئاغا فڕی.. فڕی فڕی.. فڕی فڕی ئەفەندی فڕی.. فڕی فڕی.. حاجی فڕی.. سۆفی فڕی.. دەروێش فڕی.. سە فڕی.. مریشک فڕی.. هەموو فڕین چوونە بنە بانان..

منداڵەکە: ئەدی وا دەفڕن دەنا تێدەکەون، قوڕ بە سەرتان ئەگەر شەوداهات بە ئەلەکتریکی دنیای رووناک کرد لە سەربانان لە ناو حەوشان لە کوڵانان هەمووی دیتن ئەوجا چ دەکەی.

گەورەکان: توخوا ئەمەش هەیە! ئەدی ئەوجا قوڕی کوێ بکەین بەسەر خۆمان؟ کێوە بچین کێوە بفڕین زەوی بکۆڵین بچینە بن عەردی... ئەوا تەیارە فڕی ڕۆیی بۆ کەرکوک چۆوە الحمدلله ئەو جارەش قوتار بووین، ئەوانەی زۆر کەرن دیسان دەبنەوە کەرەکەی جاران دەچنە خزمەتی شێخی دەست و پێی ماچ دەکەن قوربان لە سایەی هیممەتی تۆ سەلامەت بووین زەرەرمان نەهێنا یەکێ

ئه مـوریده زۆر زۆر کـه‌رو گـه‌وجـه‌کـان ده‌ڵێ: به‌خـوا به غـه‌وز چاوم لێ بوو بۆمـبـایه‌ک هاته خـوارێ شـێخ ده‌سـتی دا به‌رێ له ئێـمـه‌ی لادا!!. (صـدق.. صـدق). (آمننا.. آمـنـنا) هیـمـمـه‌تی شـێخ کـافـیـه (ظاهرا) خـۆی شـارده‌وه (باطنا) هیممه‌تی کرد ده‌رچووین کوڕه هه‌ر شێخ حسێبه.

منداڵه‌که: وه‌خـتـه له قـینـان بدڕێ دڵی شـه‌ق بکا. ئه‌وجـاره‌ش فـڕی فـڕی ته‌یاره فڕی له کـه‌رکوک له به‌غدا له موصل وه‌ک قـازو قـولـینـگ که له سه‌ران دێنه خـوارێ هاتـن جێ به جێ کـردیانه قـیـامـه‌ت ئاگـر باران له‌رزه له‌رز عـالـه‌م ده‌سـتی کرد به هه‌ڵاتن یا غـه‌وز یا غه‌وز شاهی نه‌قشـه‌به‌ندی ئۆمه‌ر مه‌ندان... خـاڵ خـاڵان... پیـره مـه‌گـرون... پیـرو ته‌سـه‌وری مـه‌رگی... پیـری دابان... نه‌جات (حفظ) هاوار، ده‌خیل، دیسـان هه‌مـوو خۆیان شـارده‌وه خۆیان بزر کرد گه‌لێ مزگه‌وت ته‌کیه به‌به‌ر بۆمبا که‌وتن و رمان، دووباره رۆیی خه‌ڵکی هاتنه ده‌رێ زۆر ترسان ئه‌سه‌ری ته‌جروبه‌یان دیت که‌مێک هاتنه‌وه سه‌ر هۆش ته‌مایان بوو نه‌ختێ عـاقڵ بن، لاکین هه‌ندێکیـان چوون بۆ لای شێخ، شێخ نه‌مابوو... مه‌لا نـه‌مـابوو... هه‌مـوو باڵیـان گـرتبـو فـڕیبـوون ئه‌وجا گـوتیـان به‌ڵێ به‌خـوای لیـمـان گۆڕایه هه‌ر شتـه قـاعیـده‌ی هه‌یه ئێـمـه‌به حـیـکایه‌تی قـالیـچه‌ی سوله‌یمان پێغـه‌مـبـه‌ر و باس و خـواسی عـیـفـریـتـان که‌رامه‌تی شـێـخـان هه‌ڵخـه‌ڵتـاین فـلان سـواری قـالیـچـه‌ی سـوله‌یمان بوو گـوتی: به حـه‌قی سـوله‌یمان بمبـه فـلان جێ... ده‌ست به‌جێ بردی عـیفریتـه‌کان کچی پاشایان هه‌ڵگرت به بناغـه‌وه بردیانه ناو حـه‌وت به‌حـران، له جـه‌زیره دایان نـا هه‌ندێ ئه‌ولیـا چاویان لێ بوو کـه‌عـبـه له جێی خۆی نه‌مـایه چووه به پیر رابیـعه‌ی عه‌دده‌وی ئه‌مـان ره‌بی ده‌خیل ئه‌مه چی بوو چۆن وای لێ هات؟ ئه‌و هـات و باتی حـیـکایه‌ت به جـارێ ئێـمـه‌ی گـۆڕی ئه‌گـه‌ر لێ گـه‌ڕابـاین هیـچ نه‌با له جـێـی خـۆمـان ده‌مـاین ئه‌وه‌نده به عـاردیدا نه‌ده‌چوینه خوارێ وه‌ک له حـیکایه‌ت ده‌ڵێ ئه‌حـمه‌د که‌وته ژێر زه‌مین، پێـیـان گـوت: دوو به‌ران دێن رۆژی جومـعـه خـۆت هه‌ڵده سه‌ر به‌رانه سـپـیـه‌کـه سه‌ر ده‌کـه‌وێ ئه‌گـه‌ر بـکه‌ویتـه سـه‌ر به‌رانه ره‌شـه‌کـه له حـه‌وت ته‌به‌قـه‌ی زه‌مین روو

دەچی، قـور بەسەر خۆی هەڵدا دەکەوێتـە سەر بەرانە ڕەشەکەی دەکەوێتـە بن حەوت تەبەقەی عاردی، چ بکەین سووچی ئێـمە نەبوو مەلای چاک لە وەعز دەیفەرموو فلان بە شەقاوێ دەچێتـە مەکە دەفرێ دەچێتـە ئاسمـان (سدرة المنتـهی) بە هەشت کـورسی عـەرش، هەمـووی دەگەرێ نەمـان دەوێرا دەنگ بکەین کەرامەتی ئەولییا حەقە لە کتێبی عەقیدە نوسرایە وەک موعجیزەی پێغەمبەران دەبی ئیمانی پێ بێنین بە تەمای وان لێ گەراین...

منداڵ بە فترەتی خودا زۆر زیرەکن دیارە سوئال دەکەن..

منداڵ: بابە ئەو بارانە کـو دەبارێ؟ وا دنک دنک، قـەترە قـەترە دێنە خوارێ.؟

باب: رۆڵە ئەوە مەلائیکەت دەچن لە بەحری رزقی مـەقسـوم ئاو دێنن بە بێژنگی دادەکەن وەکو دەنکە گەنم و جۆ لە بێژنگ دێتە خوارێ ئەمن لە مەلام وا بیستیە!!

منداڵ: ئەدی لۆچی هەندێ جاران بە رێژنە دەبارێ دنکی وورد دێتە خوارێ وەک خـوناوی رەشمـالان بینا بە فـەرمـوودەی تۆ دەبی قـەربیل و سەرمـەد و هیرەکیان هەبی...

باب: سەیری ئەو هەتیـوە بیـژیە ئەوە دەرسی شەیتـانە بە قسـەی مـلایان بڕواناکات..!!

منداڵ: ئەدی بابە ئەو بروسکە ئەو گرمە گرمی هەوری چییە؟

باب: ئەگـەر سـونی بی دەڵێ رۆڵە ئەوە مـەلائیکەتە کـە بە قـەدەر زەنگە سـورەکی قـەمـچی یەکی ئاگـرینی بە دەسـتـەوەیە لە هەوری دەدات بەسـەریدا دەهارێنێ ئەو بروسکە ئاگری قەمچی ئەوە ئەو دەنگە گەورە نەڕەی وییە،

منداڵ: ئەی بە عـزەن (بعـضـا) بروسکە لە عـاردی دەدا ئینسـان، حـیـوان دەسوتێنێ وە ئەو جێیە بۆنی باروتی لێ دێ وە هەندەک جار لەو جێگایە ئاسن دەدۆزنەوە.

باب: ئەی لەم مـاڵ خراپە هەتیو تۆ چت بەسەر شتی وایە وەڵڵا سـەرم بە

فەتارەت دەدا ئەم شەیتانە ئەگەر شیعە بی ئەلیٚ ئەوە نەعرەی ئیمامی عەلییە نوری ددانی وییە رۆڵە ئەدی پیٚغەمبەر نەیفەرمووە:

(علي والسحاب صلوات الله وسلام عليك يا أمير المؤمنين)

(مجتهدی) (نجف)ی ئەشرەف کەربەلای معلاوایان فەرمووە.

ئەلّبەتە وایە تەمام منداڵی شیعە زوو بروا دەکات ئەمما منداڵی سوونی زرینگن بە قسەی پرِوو پوچ هەل ناخەلّەتیٚن ئیللا ئەوانەی وەک شیعەن کە ئیمانیان بە ئیمام هەیە کە ئیمانی بە شیخان ببیٚت ئەوانیش ئەگۆرِین وە ئیللا منداڵی سونی بە تایبەتی منداڵی کوردان قەد لە زەکای فیترِی خلقی ناگۆرِیٚن ئیمرِۆ شوکور بە نەوعیٚک منداڵە کورد بۆ ئەوجی ئەعلا دەفرِن ئەوەی دۆستە حەقەن کەیفی پیٚ دیٚ لەسەر ئەم بیٚکەسییە باش دەخویٚنن عاقیبەت هەر بۆیان باش دەبیٚ دەچن. بۆ هەرە پایەی بلّندی رجام لە بیٚچوە کوردان ئەوەیە: بە قسەی پرِو پوچ نەگۆرِیٚن تەماشای خودابکەن خەلّکو ئیجادی ئەو بیٚننەوە بەر چاو قەواعیدی فترِی تەماشاکەن (خوارق العادة) چنیە گویٚنەدەنیٚ چی خودا کردبیٚتی بە عادەت ئەو باشە ئەگەر بە عەقلّ تەماشای کەرامەتیان کردبا دەیانزانی فائیدەی چییە بۆ هەموو شت تەشەبووسیان بە کەرامەت نەدەکرد ئەوا راستە شیٚخ فرِی بە لۆقیٚ دەچتە مەککە نویٚژی سبەینیٚ لە مەککە دەکا ئیشراق (اشراق) لە مەدینە زوحا (ضحا) لە قودس نیوەرِۆ لە بەغدا بۆ عموم میللەت. میللەت چ کەڵک دەکرِی تاکو ئیمرِۆ حەجاجی قورِ بەسەر پشتی دەشکا لەسەر حوشتر گەلیٚکیان بەردەبوونەوە ئەست و کوردیان ورد دەبوو، چل پەنجا رۆژ بە سواری حوشتر حندر حۆییان دەکرد توک و لوکیان دەچوو.

چ فائیدەی بوو بۆ میللەت چووە مەککە نەچوە مەککە فرِی نەفرِی تەماشای (لوح المحفوظ) ی کرد ئەوی تیٚدا بوو بۆبە (کشف) بوو چ سودی نەوتی بابە گورِ گورِ دەگریٚ لافاوی هەستا بەغدای ترسناک، ئاوی نەوتاوی بکا بە عیلم و فەن و هەندەسە زەوتیان کرد تەمایانە ئەو نەوتە بۆ ئەوروپا ببەن ئیمە خۆمان لە ماڵی خۆمان بیٚبەش بووین کەشفی عیلمیان نەبوو ئەو لەناو

عەردی بوو لێمان بزر بوو ئەجانب بەدەریان خست ئیمە خەریکی لەوح بووین قەیناکە لەمەش سەرفی نەزەر (صرف النظر) ،ئەم قورئانە کە لە لەوحی مەحفوز (لوح المحفوظ) بۆ پێغەمبەر هاتۆتە خوارێ بۆ ئەو مەلاو شێخانە تەمەشای ناکەن؟ هەتا کەمیان بەرِدش خوێنیش دەیزانن بە مەعنا هیچ، ئەویش خراپە نابێ ئەوان کە ئیمانیان هەیە بە قورعان کەلامی خودایە بیزانن فکری موسڵمانیان هەر بەولاو بەولا دا دەفڕی بەراستی روو لە ڕێگەی راست ناکات.

(فڕی فڕی... بەفکرم هاتەوە... کەری دەجالی فڕی) کەری وا هۆڕو هۆپ گوێ ئەوەندە درێژ ۷۰۰۰۰ هەزار جوو لەبن سێبەری گوێی رادەوەستێ شەقاوی لە مەدی نەزەر (النظر) بە چل رۆژ هەموو دونیا پێ دەگەڕێ خسوسەن نەڕرە دێوەکی وەک دەجالی سوار بووە. ئەمما نازانم جولەکەکان کو لەگەڵ ئەم کەرە دەردەچن...!

منداڵەکە: ئەوە کەرامەتی ئەولیامان سەلماند عەبدی خودان عیبادەت دەکەن با کەرامەتیان ببێ ئەدی دەجال ئەوچییە ئەویش خۆشەویستی خودایە...؟!

خودا ئەو هەموو ئیشانەی بۆ دەکات...!(فڕی فڕی هەموو خەزنەی دونیای لە دوای سەری وەک زەنگە سورەو زەردەواڵە و مێشە هەنگوینیە بە هاژە هاژ گرمەگرم، دوای دەکەون بە ئەمری وی دەفرن) ئەوە بۆ فڕی؟ (فڕی فڕی ئەم چیایە بە ئەو چیایە بە ئەمری ئەو لە رەگ و ریشە لە عەرد دێتە دەرێ بە حەوا دەکەون دەفڕن وەک دوو بەران شەڕە قۆچێ دەکەن لەم بەرو لەم بەرە بۆ کەس نەبووە کو رێک دەکەوێ؟...!

گەورەکان، ئێمە موسڵمانین بە قەولی مەلایان موسلمانین ئەوەی ئەوان فەرمویانە بروا دەکەین هەتا دەفرن بە رووبار نان و گۆشتی بە دووا دەروا !!

منداڵ: چ رووبار چ نان چ گۆشت بەخوا ئەوە قسەیەکی سەیرە خۆزێ ئەمن لەناو ئێوە گەورە نەبوبام ئەو قسانەم نەبیستبا لە ئێوە هەرچی مەلایەکی ئێوە

دووای قسـەی بکەون ئەوە قـەت نابێ ئەمـە دیارە مـەلا زۆر برسـیـیـە بێ نانە ئاردی لە مەلا نیە لەمێژە گۆشتی نەخواردییە تامەزرۆیە خەون بە نان و گۆشت دەبینێ (الخیر لنا والشر للأعدائنا) لام وایە تەعبیری ئەم خەونە ئەوەیە ئیمڕۆ سبەینێ کێخوا خێری لۆ خەسوی دەکا دوو سێ حەیوان سەردەبڕێ دەیکا بە کەشکەک، مـەلا دەعـوەت دەکـا سـەڵلەی پڕ نـان تەبەقی زەلامی پڕ لە چێشت لەبەر دەمی دادەنێ مـەلا عـافـێتی دەکـا، لا ڕانی دەنێـرێتـە مـاڵی مـەلا مـەلا نەختێ بە کولاَوی نەختێ بە برژاوی یەک دوو زکی تریشی لێ دەخوا، یا کەسێ بووە وەک (بسحاق) حەزی لە تەعام بووە ئەمما (بسحاق) چاکە باسی طعامی خۆش دەکات (واقعیاً) ئەویش حەزی لە قـاورمەی بووە لەگەڵ (بغراد) یەعنی سـاواری رزی رواندزیان، ئەوەندە نان و گـۆشت لۆ تریت خـۆرەکـانە ئەمـە لە مەلای چاک دوورە، گۆشت و نان و حەز بە درۆ هەڵبەستراوە خەیاڵ و خولیای برسـیـانە دوورە لە پێغـەمبـەر، پێـغـەمـبەر وەحی لە خوا وەردەگرێ تەشریعی ئەحکام دەکـا دوورە لەم قـسـە پڕو پووچە خـسـوسـەن (خـصـوصـا) تەعـریف و تەوسیفی (توصیف) کەری دەجالی یاخوا لەعنەتی خوا لەو کەسە بێ کە درۆ بە زاری پێـغـەمـبـەر هەڵدەبەستێ، عـالەمی مـاڵ وێران کـرد کـردنی بە کـەری نەفـام... هیـچ نەزان... باوکم وەرنە سـەر حـاڵی مندالی بەخـوا زۆر باشـتـرە (قڕی فڕی قـول فڕی) دەست هەڵمەبرن ئەوە مەقسـودی قولە رەشە چۆن دەفـری بە چ دەفـری؟ دەزانن وە سـەر و بن دەبن، وەک هارووت و مـارووتی سـەرەوژێر هەڵدەئاوسرێن بەڵێ ئەویش حیکایەتی زەمانی پیرییە، موسـڵـمـان کە گەورە بوون گـوێیـان و عـەقلیـان تەواو دەبێ، ئیـمـانیـان بە قـووەت دەبی، ئەوجـا عەجائیب و غەرائیب بروا دەکەن:

خۆشناوێ مەدحی کەری خۆشناویەکی دەکرد دەیگوت: بەخوا کەرا تۆ ساتێ دەنگ خۆشە... ئەویش بەیانی تەشەککوری دەکرد دەیگوت مـاڵتا سـەد جار ئاوا بێ هیچ چاکەم بۆتا نییە وا لە پیاوەتی مەدحی کەرێم دەکەی...! مـاڵی مـوسـوڵمـانان سەد جـار ئاوابی دەجـال. هیـچ پیـاوەتیـشی بۆ وان نیـە ئەوان

ئەوەندە مەدحی کەرێم دەکەن، فیلێک هەیە لەناو کوردان (کۆتر فرینکێ)ی پێ دەڵێن وا دەبی کچەکی گچکە دەدەنە پیاوێکی زەبەلاح، لێی مارە دەکەن بۆی دەگوازنەوە کچەکە لێی دەترسێ بۆی راناوەستێ ئەویش دەڵێ وەرە کۆتر فرینێکت پێ بکەم بۆ خۆت دەفری، بە پەت دەست و پێی دەبەستێتەوە ئیشی خۆی لەگڵ دەکات... یەعنی ئەوەی لاقی بە پەتەوە بی چی بەسەر دێ... !؟

حاسل (حاصل) لازمە ئینسان ئاگای لە لاق و دەستی خۆی بی وە ئیللا تێ دەکەوی... بەڵێ ئەگەر ئیمرۆ بڵێین... فری فری عەقڵ لەناو موسوڵمانان فری راستە گورج دەست هەڵبرە... ئەگەر بڵێین فری فری عیلم و زانین لەناو کوردان فری وایە... خێرا دەست هەڵبرە، هیچ رامەوەستە نە عیلم نە عەقڵ نە فکر نە تەنقید و موحاکەمە لەناو موسوڵمانان خسوسەن لە ناو کوردان ئەوانی تابعی شێخانن نەمایە فری رۆیشتیە لام وایە نایەتەوە، بەڵام مەگەر منداڵانی تازە پێ دەگەن فیلەکی بکەن فاقەو داوەکی دابنێنەوە بەڵکو تەیری عیلم و عەقلی پێوە دەبی دەیگرنەوە. ئەویش لازمە باوکەکان لێیان گەرێن لەسەر عەقلی (فطری) گەورە ببن لێیان نەگۆرن خودا بە مەرحەمەتی خۆی عەقلێکی چاکمان پێ کەرەم بکا... امین.

**رۆژی چوارشەممە و جومادی ئەوەڵ**
**سەعات (٨) دەقیقە (٢٥)**
**ساڵی ١٣٤٦ محەمەد (١٩٢٧ز)**

# جەلیزادە شاعیر

مـلای گـەورە لە سـەرەتای پێگەیشـتنیـەوە بەهرەی شـاعـیـریەتی هەبووە شیـعری داناوە، لە توانایدا هەبووە ببێ بە شـاعـیـرێکی ناوداری بەرهەم زۆر، هەڵبەستی بەهێزو پتەو و مانا قوڵ و لە بار دابنێ بەڵام لەبەر دوو هۆی گرنگ خوی نەداوەتە شیعر...

**یەکەم/** ئەوەندە خەریکی خوێندن و مەلایەتی بووە، مەوداو کاتی خەریک بوونی بەشتی دیکەوە لێ کورت بۆتەوە، مەسەلا لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا کە هەرەتی گـەنجی و لاویەتی بووە یەک سـاڵی تەواو لە مـزگـەوتی گـەورە دەرنەهاتیـە وە پێی بە کۆڵان نەکەوتوە جا لەو ساڵەیدا ماوەی چەندین ساڵی خوێندنی بڕی، بوو بە هۆی ئەوەی ئیجازە بدا بە هەندێ لە هاوڕێکانی.

**دووەم/** لەو تەمەنەدا رازی نەبووە شیـعـرێک بڵێ لە هی شـاعـیـرە هەرە بەرزەکـان کەمتـر بێ، کە ئەوەش کـارێکی ئاسـان نییـە وە خۆ تەرخان کـردنی دەوێ، دەبوایە واز لە خوێندن بێنێ بۆ مەبەستی هەڵکەوتن لە شاعیریدا لەگەڵ ئەوەشدا با بڵێین ئەو هۆیانەی کاریان کردۆتە سەر ملا محەمەد کە شیعر دابنێ و کۆمەڵە شیعرێکی نەتەواتی پڕ بە هامان بۆ بەجێ بێڵێ چی بووە؟

وەک بۆمـان دەرکەوت جەلیزادە هەرچەندە شیـعری دڵداریشی هەیە بەڵام گـیـرۆدەی دوای دڵداری چ دولبـەرێک نەبووە، وە لە کـاتێک هاتۆتە دونیـای شـیـعـر دانان کـە دەوری لاویـەتی و هەرزەکـاری بەسـەر بردووە.. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ورد گـەیشـتـینە ئەوەی کـە لە هەمـوو شـتـێک زیاتر کـاریان کردۆتە سەر جەلیزادە پەتا بەرێتە بەر شیعر و شیعر دانان:-

١- شیـعرە نەتەوەییەکـانی شاعـیری مەزنی کورد حاجی قـادری کۆیی بە رادەیەک هەست و هۆشی داگیر کردووە کە لە زۆربەی زۆری دانیشتن و وەعزی رەمەزانانیـدا شیـعری ئەوی بۆ خەڵکەکە خوێندۆتەوە، پێشـەکـیش ووتویەتی حاجی قـادر وا دەفەرمووێ کـە ئەو شێوە ناوبردنەش ڕێز و پایە بەرزییـەکی لە

ئەندازە بە دەر دەگەیێنێ، وە لە شێوە و دارشتن و بیروباوەر و مەبەستیشدا هەر چۆتە قوتابخانەکەی ئەو شاعیرە مەزنەوە شیعرەکانیشی وەک ئەو ئاسایی شێوەی خیتابی و روو تێکردنی وەرگرتووە مەبەستیش لەوەدا هۆشیارکردنەوە و چارەسەرکردنی کەم و کوری و ناتەواویەکانی کۆمەڵی کوردەواری بووە بە واتایەکی تر شیعری کردۆتە چەکی دەستی بۆ خەباتی سیاسی و دەبرینی هەستی پر سۆزی نەتەوایەتی، لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش داخۆ لەو سەردەمەدا مەلای گەورە کام رێباز بگرێ؟

لەو کاتەی کە پاشماوەی دووا کەوتوویی گەلی کورد لەپاش حاجی قادرا چ گۆرانێکی ئەوتۆی بەسەرا نەهات مەگەر لە هەندێ لایەنەوە نەبێ؟ ئا لەو کاتەی کەوا میللەتەکەی دووچاری ژێر دەستی و پابەندی بیر و باوەری دەروێشایەتی و چەوسانەوە و نەخوێندەواری و هەژاری بوو.. داخۆ رێبازی شاعیرانی کلاسیکی بگرێ بە چاوی کاڵ و زولفی لوول هەڵبڵێ..!؟ یاخود پەیامی پیرۆزی حاجی شۆرشگێر تەواو بکا و لەسەر خەبات و تێکۆشانی ئەو بەردەوام بێ؟.. بێگومان پیاوێکی نیشتمانپەروەری کورد خواز و دڵسۆز. زانایەکی بێ مانەندی وەک جەلیزادە رێباز و هەست و مەبەست و شێوەی بیر و را بە نرخەکانی حاجی قادر پەیرەو دەکا.

٢- هۆیەکی گرنگ و کاریگەر تر کە بۆتە هێوێنی شاعیریەتی جەلیزادە لە سەرەنجامی کارەساتی خوێناوی شۆرشەکانی ساڵی (١٩٢٥)ی کوردی تورکیا وە لە سێدارەدانی سەرکردە نەمرەکانی (شێخ سەعید) و (شێخ قادر) و (دکتۆر فۆاد) و سەدانی تر وە قەلا چۆکردنی گەلێ گوند و لادێ، لەناو بردن و کوشتنی هەزاران ژن و منداڵ و پیاوی بێ تاوانی کورد، دەربەدەر کردنیان لە شوێن خاک و هەوارگەی باب و باپیرانیان، ئا ئەو کارەساتە ناسوورە جەرگ برانە کارێکی زۆریان کردە سەر هەست و دڵ و دەروونی مەلای گەورە، هێزێکی بە تەوژمی هەست بزوێنی پاڵ پێوەنەر بوو کە بێتە جیهانی شیعر دانان بە هۆی ئەوەوە هەستی پر سۆزی گەرم و گوری دەرونی لە ئاست تاوانی

جانەوەرانی کار بەدەستانی تورکیای فاشی دەربیڕێ، وە بەو بۆنەوەش وەک بورکانی گێژ خواردووی ناخی ئەرز ووشە ئاگرینەکانی لە دڵ داگیرساوی هاتە دەروو گوتی:

**من یەخەی خۆم لە بۆیە دا ئەدڕم**
**ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم**
**دەبێ من کەیفی چیم بە دونیا بێ**
**قەومی من وا رەزیل و ریسوابێ**

پاشان دەڵێ:

**قوڕی کام جێ بگرمەوە بۆتان    بۆ برایانی جەزیر و بۆتان**
**خۆمی دونیا بکەین بەسەر خۆمان    بۆ عەزیزانی ئەرزەرۆم و وان**

٣- مەلای گەورە هەر کە چاوی هەڵهێناوە لەناو زادەگانی زانست و ئەدەب و شیعردا خۆی دیووەو لێی پەروەردە بووە دەتوانم بڵێم ئەوەش تا رادەیەک کاری کردۆتە سەر بزوێنی ئارەزووی شیعرو شاعیریەتی، حاجی مەلا عەبدوڵلای باوکی جگە لەوەی زانایەکی بەرزی ئاینی، شاعیرێکی بەتواناش بووە حەزینەی[٤٣] خێزانیشی (زڕ دایکی مەلای گەورە) شاعیرێکی بەهرەدار

---

٤٣- حەزینە: ناوی خاتو (زەینەبە) کچی شێخ عەبدول کەریمی شێخ ئەحمەدە خێزانی حاجی مەلا عەبدوڵلا بووە. خوێندەوارو شاعیرێکی بە توانا بووە ئەگەر چی بەرهەمی شیعری زۆر نەبووە ئێمە تەنیا بەشێک لەم پارچە شیعرە شیوەنی دەخەینە بەرچاو کە بەبۆنەی کۆچی دووایی هاوسەری ژیانی حاجی مەلا عەبدوڵلا داناوە:

**ئەی رەفیقانی شەریعەت بێن بکەن گریان و شین**
**حەیفە بۆ ئەو قوتبی کامل کۆچی کرد بۆ ژێر زەمین**
**حەیفە بۆ ئەو گۆهی عیرفان و دەلیلی راهی هەق**
**پێشەوای ئەهلی مەحەبەت ئەو (رئیس العاشقین)**
**ئەو چراغی خانە دانی عیلم و فانۆسی خودا**
**تالبی راهی خوداو ناصبی ئەعلامی دین**
**وەک جەنابی حەق تەعالا مەرحەبای فەرموو لەوێ**
**رووی لەوێ کردو لە دونیای کرد ویداعی ئاخرین**

بووه تەنانەت لەزۆر كۆڕو دانیشتنە تایبەتیەكانی خێزانیدا خۆبەخۆیی بە شیعر لەگــەڵ یەكــتــر دووایین مــەســەلا جــارێ حــاجی مــەلا عــەبدوڵڵا بە ناوی ئامۆژگارییەوە روو لە مەلا محەمەد دەكا كە ئەوسا منداڵ دەبێ پێی دەڵێ:

**مـــەبە مــــەشـــغـــوڵی گـــوزانی و رگـــانێ**

**مــــەكـــــە مـــــەیلی جگ و هێلكە شكانێ**

**لە دونیـــادا عـــەمـــەل تەحـــســـیلی عـــیلمـــە**

**كـــەسێ عـــــیلمی هەبێ دائیم بە حـــیلمـــە**

جارێكی تر لە دانیـشـتنێكی خێـزانیـدا لەسەر نان خـواردن دەبن شـێخ نورەدین برای جـەلیـزادە دەڵێ: ئیـمـشـەو لە خـەومـا كـەوتمە ناو ئاوێ و تەڕ نەبووم!! مەلای گەورەش دەست بە جێ دەڵێ:

**ئەو شـێـخـە چ شـێـخـێكە كـە تەڕ نەبووە لە ئاوا**

حاجی مەلا عەبدوڵڵا وەڵام دەداتەوە دەڵێ:

**ئەو شـــێـــخـــە برای تۆیە وەكـــو نورە لە چاوا**

وە شیـعریان بە رەوانبێژی و هونەرو وردەكاری زمان زانـی داناوە بە هۆی ئەوەوە كە دەبێ زانایان ئەسپی خۆیان لە هەموو مەیدانێكدا تـاو بدەن و خۆیان تێدا تاقی بكەنەوە تەنـانەت بە تایبـەتی لەو سەردەمـدا ئاڵ و گـۆڕی نامـە بە شیعر شتێكی لەباو بووە.

٤- بێـگومـان نابێ ئەوەش لە بیـر بكەین لەپاڵ ئەوانەی باسـمـان كـردن دیمەنی چاو ئەندازی رازاوەی باغ و دۆڵ و كێـو و مێـرگ و مێـرخوزاری پڕ لالە زاری شـاری كـۆیە كـاری زۆر لەسـەر هەست و ئەندێشـەو خـەیاڵـی بەرزی مـرۆ هەیە ئەم شارە لە دێر زەمـانەوە شەخسـیەتێكی زاتی جیـاوازی بە خۆیەوە دیووە گەلێ زاناو ئەدیب و شاعـیر و پیاوی ناوداری لێ هەڵكەوتووە ئەوەش یاسـای سروشـتـە كە هەركەسـە چەكەرەو نشـونمای زادەو شـوێن و كـۆمـەڵگای تـایبـەتی خـۆیەتی ئیـتـر بەلای منەوە ئەو هۆیانە تێكڕا بونەتە هێـوێنی مـاخـۆلیـای بوونە شـاعـیریەتی جەلیزادە.

مەلای گەورە ئەوەی باش زانیوە کە دەردی کوشندەو ماڵ وێرانی کورد دوو بەرەکی و یەک نەگرتنی رۆڵەکانییەتی بۆیە هەمیشە هەستێکی کوردایەتی پیرۆزو خۆشەویستیەکی پڕ سۆز لە زۆربەی شیعرەکانیدا دووبارە دەبێتەوە ئەوە دەگەیێنێ گەر هەموو دەستەو چینەکانی نەوەکەی یەکتر بگرن کوردیش دەتوانێ وەک گەلانی تری ئازاد ئەویش ببێ بە خاوەنی تەخت و بەختی خۆی جا بەم شێوەیە داخی دەروونی خۆی دەردەبڕێ:

**ئێــــوە هەر چەندە قــــــەومــــێکی زۆرن**
**فــــائیــــدەی چی کـــە توخــمی خــۆ خــۆرن**

وە لە شوێنێکی تردا ئەو لایەنە دووبارە دەکاتەوە دەڵێ:

**ئەگــەر عــیــزت دەوێ هەســتی بە هیــمــەت**
**بە فــیکرو ســەبرو تەدبیــرو کــیــاســەت**
**ئەبێ مــیللەت هەمــووی یەک بن لەگــەڵ یەک**
**لە ئەربابی قـــــەلەم تا خـــــاوەنی چەک**

مەزنی جەلیزادە تەنیا لەوەدا نیە کە شاعیرێکی نیشتیمانی و زانایەکی بەرزی تێگەیشتو وەیا رابەرێکی نەوەکەی بووە، شارەزایانە کەمو کوڕیو ناتەواویەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی گەلەکەی دەست نیشان کردووە بەڵکو گەورەیی لەوەدایە لەگەڵ دۆزینەوەی ئەو دەردو کێشەو تەنگ و چەڵەمانەدا چارەشیان بۆ دەبینێتەوە، مەلای گەورە دووای ئەوەی داوای تەبایی هەموو بەرەو توێژو چینەکانی کوردمان لێ دەکا ئینجا دێتە سەر مەسەلەی بەدەست هێنانی کەرستەی شۆڕش و خەبات و تێکۆشان، وەک لەم پارچە شیعرەدا دەریبڕیوە:

**فــرێی دەن مــونتــەشــاو بەرمــاڵ و کــەشکۆڵ**
**تەرک کــەن تەپڵ و رەقس و خــزمــەت و شــۆڵ**
**تفـــــەنگ و تۆپ و تـەیارە پـەیاکـــــەن**
**بە عـــەزمی دین و دنیـــا روو لە خـــواکــەن**
**وەکـــو شـــێـــر وەرنە مـــەیدانی جـــەرائەت**
**بە غـــیـــرەت بن بە غـــیـــرەت بن بە غـــیـــرەت**

جـەلیـزادە چەند هۆش فـراوان بووە لەو سـاوە نرخی نەوتی زانیـوە کـە چ دەوریکی بەرزی لەسـەر ژیانی دارایی و پێـشـکەوتنی مـیللەتاندا هەیە روو دەکاتە نەوەکەی تەماعی و چاو چنۆکی دەولەتە رۆژ ئاواییەکانی بۆ دەردەخا چۆن مرخیـان لە نەوتی بایەخداری (بابە گورِ گورِ) و کان و گەنجینەکانی تری ژێر خـاکی نیـشـتـیـمـانەکـەمـان لێ خـۆش کـردووە وە لە پێناوی دەست بەسەرداگـرتنیدا چەند ئاگـری جەنگ و شەڕو کوشـتـاریان هەلگیـرساندووە تا توانیان بە مەرامی خۆیان بگەن بە خێرو بێری شادو تەسەل بن خۆشمان لە ژێر باری نالەباری برسیـەتیـو رووتی و هەژاریدا بتلێنەوە خەریکی های و هۆیی دەف لێدان بین وەک لەم پارچە شیعرەدا گوتویەتی:

**ئەی کــــاکی نەفــــامی گــــەوجی مل هورِ**
**بـنـوارە لـە دەوری بـابـە گــــــورِ گــــــورِ**[٤٤]
**ئـەو نـەوتـە چ بـوو چـلـۆن بـەدەرکـــــــــەوت**
**چۆن هەلـدەقــــولێ مــــەنابیــــعی نەوت**
**ئەو نـەوتـە بـوو ئـاگــــــری هەلایـســــــاند**
**چەند دەولـەت و تـاج و تەخـــــتی فــــەوتاند**

هەرچەندە مەلای گـەورە زانایەکی ئاینی بـووە، بەلام هەرگـیـز بەچاوی بیـر تەسـکی رەگـەز پەرسـتی سـەیری گـەلانـی تری نەکـردووە لەپال ئەوەی نەوەی کوردی زۆر خۆشویسـتووە بە هەستی پڕ سۆزی مرۆڤایەتیش تەماشای خەبات و تێکۆشـانی مـیللەتانـی جیـهـانی کـردووە پێی خۆش بووە هەمـوو نەتەوەیەک بە ماف و ئاواتی خۆی بگا لە ژێر باری جەورو سـتـەم و زۆرداری و چەوسانەوەدا

---

٤٤- شەوێک مستەفاغا دەچێتە لای جەلیزادە پێی دەلێ: مستەفا ئیمشەو تا بەیانی خەوم لە چاو نەکەوتووە!! ئەویش دەلێ لەبەر چی؟ دەلێ: لەبەر چوار شت.. یەکەم: لەبەر حەپە حەپی سەگان بەدووای ئەودا هەرا و هۆریای ئەو دەروێشانەی کە تا بەیانی خەریکی هەلپـە هەلپ بوون، پاشان تەق و تۆقی شـەڕە تفـەنگان، چواردم لەبەر ئەو ئاگرەی کە لە نەوتی کەرکوک داگیرساوە کە هەمـووی گەنجینەی خۆمانە و بە تالان دەڕِوا بۆ ولاتانی بێگانە، ئێمەش لێی بێ بەش و کەساد و برسین!!

رزگاری ببێ ئەو تەرزە بیرو باوەڕەی ئەوسای جەلیزادە کە ئیمڕۆ بە بیرو بڕوایەکی پێشکەوتنخوازو دیموکراتیەت دادەنرێ بەڵام مەگەر چۆن دەنا لەو سەردەمەدا وە بگرە ئێستاش زانای ئاینی هەرچی لە سنوری دەستوری ئیسلامدا بەدەر بووبێ ئەوا بە لەعنەتی کردووەو دەیکات.

مەلای گەورە ئەو هەستەی لەم پارچە شیعرەدا دەرخستووە کە خۆی وەک پیشەوای هیندی مهاتما غاندی هێناوەتە بەر چاو کە دەڵێ:

**منیش هەر وەکو غاندی  هەناسە سارد و ماندی**
**لە قەومی کورد و هیندی  هەرچی خێر بوو نەماندی**

یا لە دەرونێکی ئەوەندە پڕ سۆزو هەستی ناسک شیوەن بۆ (سەعد زەغلول)ی میسری دەکا دەتوانم بڵێم لەناو نەتەوەکەی خۆشی ڕێزو ستایشی لەوە زیاتری بۆ نەکراوە کە دەڵێ:

**عەرەب و کورد و هیند و قەومی مەغول**
**هەموو مەحزونە بۆ سەعد زەغلول**
**بۆی دەگریم بە خاترێکی مەلوول**
**دەک لاڵ بم بۆ سەعد زەغلول**

ئاسۆی بیرو فیکری جەلیزادە[٤٥] لە دونیای سیاسەتا زۆر فراوان و دووربین بووەچارەنووسی دووا ڕۆژی کوردی باش ڕەچاو کردووە کە دەبێ کورد پشت بە بێگانە نەبەستێ بەڵکو مافی ڕەوای خۆی بە ڕەنج و هەوڵ و خەبات و تێکۆشانی ڕۆڵەکانی بێنێتە دێ، بە دووری زانیوە داگیر کەر کورد بگێنیتە

---

٤٥- زۆر لە ئەدیب و نوسەران بە کوردی و عەرەبی لێکۆڵینەوەو پایەی زانستیو ئەدەبیو ژیاننامەی جەلیزادەیان نوسیوە، تا ئەوەی لەم دووایییەدا مامۆستای زانکۆ (جەواد فەقێ عەلی چۆم حەیدەری) دکتۆراکەی بە زمانی عەرەبی لە ژێر ناوی « محمد بن عبدالله الجلي» بەدەست هێناوە لە چاپخانەی پەروەردەیی هەولێر چاپ کراوە (٢٠٠٦) وە پشتی بە گەلێک سەرچاوەی باوەڕ پێ کراو بەستوە.

ئاوات و ئامانج، وەک خەلاتێک سەربەخۆیی پێ ببەخشرێ و بەسەر شانیدا بدرێ، بێگومان ئەوەی زانیوە کە داگیرکەر هەمیشە بیر لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دەکاتەوە وە هیواو ئاواتی گەلی کوردیش هەرگیز لەگەڵ نیازو مەبەستی سیاسی ئەوسای ئەوان نەگونجاوە رۆژ بە رۆژیش باری دنیای سیاسەت لە گۆرانە ئەو گۆرانکارییەش بە چ بارێک بەلای سودو قازانجی کوردەوە ناسورێ، ئەو بیرو رایەی جەلیزادە پێچەوانەی مەزەندەو رای گەلێ لە پیاوانی سیاسی و لاوانی خوێندەواری سەردەمی خۆی بوو وەبگرە تا ئەم دووایەش گۆیا بە یارمەتی و پشتیوانی وولاتە رۆژ ئاواییەکان کورد دەتوانێ ببێ بە خاوەن تەخت و بەخت و کارو دەسەلاتی خۆی ئاکامی بەسەرهات و مێژووی خەباتی سەختی کورد راستی رای جەلیزادەی دەرخست وە بۆچونەکەشی راستەو دەمەتەقە بە خۆیەوە هەڵناگرێ چونکە مێژووی سیاسی رووداوو راپەرینی گەلانی ئازادی خوازی جیهان ئەوەی پێ سەلماندووین کە هەر نەتەوەیەک بۆ خۆی زیندو و بەتین و تواناو خەبات گێڕ و ئازا نەبێ بە هێزی باز و شان و پیل و هیمەتی رۆڵەکانی نەبێ خەیاڵی خاوە چاوەڕێی گەلێکیتر بێ لە رووی بەزەیو مرۆڤایەتیەوە دەستی بگرێ و بەرەو ژیانی سەرفرازی و کامەرانی ببات وەک لەم پارچە شیعرەدا دەری بڕیوە:

**سووری مو زەردی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بی**(٤٦)
**ئەوەل بە قووەتی خۆت، دووەم بە عەونی رەبی**
**عیلم و عەمەل خۆیەتی، جەهل و تەمبەڵی مەرگە**
**پۆست و زەرگان فرێدەن وەعدی تۆپ و تفەنگە**

---

٤٦- مەبەستی ئینگلیزە. وا دیارە ئەم شیعرە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیکی دوورو درێژی دانراوە و ناهومێد کورد دیار دەخات. ئەوەش پێچەوانەی رایەکانی پێشویەتی کە ئومێدی هەبووە کورد بتوانێ بەهۆی ئەوانەوە مافی خۆی وەدەست بێنێ بە گوێرەی ئەو عەرزو حاڵ و یادداشتەی داویانە بە حاکمی سیاسی.

له شوێنێکی تردا شاعیر ئازایەتی و نەبەردی هۆزی میراودەلیمان دەخاتەوە بەرچاو کە چۆن شیرانە بەگژ سێ دەوڵەتدا چوونە و کاری مەردانەیان نواندووە لە کاتێکدا سەیر دەکەین کوردستان چەندەها تیردی قارەمانی وای تیدایە بە هەلومەرجی ئەوەی گەر هەمـوو تەباو رێک بن دوژمن هەرگیز ناتوانێ خۆی لەبەریان راگرێ، وەک لەم شیعردا گووتویەتی:

**تەماشای عەشرەتی میراودەلی[٤٧] کەن**
**بە سێ جار سەتوەتی سێ دەوڵەتی برد**
**لە ئەوەل زەڕبەیەکی دا لە تورکان**
**لە ئەستەنبۆڵەوە لەرزی خوداوەند**
**دووەم دەردێکی دا سەرداری ئیران**
**ڕەزا خان ئیلتیجای برد بۆ دەماوەند**

---

٤٧- (میراودەلی) بەشێکن لە عەشیرەتی پشدەر و هۆزێکی ئازای کوردن لە قەڵادزێ.

## من یەخەی خۆم لەبۆیە دائەدڕم

ساڵی ١٩٢٦ مامۆستاو قوتابیان لە کۆیە بەبۆنەی کارەساتی لەسێدارەدانی سەرکردەو رۆڵە قارەمانەکانی کوردی تورکیا بەشێوەی خۆپیشاندانێک روو دەکەنە ماڵی مەلای گەورە ئەویش ئەم پارچە شیعرە هەست بزوێن و پڕ سۆزەیان بۆ دەخوێنێتەوە کە دووەم شیعری نەتەوایەتی بوو.

**من یەخەی خۆم لەبۆیە دائەدڕم**
**ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم**
**دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ**
**قەومی من وا رەزیل و ریسوا بێ**
**بێ کەسو بێ دەرو فەقیرو هەژار**
**بێ سەرو سەرفرازو بێ سەردار**
**ئەوی رێگای لە کوردەکان گۆڕی**
**لەعنەتی خوا لە ئەلحەدو گۆڕی**
**میللەتی وا فەقیرو بەستەزمان**
**بە قسەی ئەو کەسانە چۆن خەڵەتان**
**قوڕی کام جێ بگرمەوە بۆتان**
**بۆ برایانی جەزیرو بۆتان**
**خەمی دونیا بکەین بەسەر خۆمان**
**بۆ عەزیزانی ئەرزە رۆم و وان**
**ناوی کوردی نەما لەنێو تورکان**
**پەتی تورکان و گەردەنی کوردان**
**با ووجودی کە قەومەکی زۆرن**
**فائیدەی چی کە توخمی خۆ خۆرن**
**وا دەزانن کە کوردە گەل زیندون**
**وا دەبینم عەلەل عموم مردوون**

وا رەزیل و زەبون و بێ دەســـــەڵات
رەبی ئەو قەومە بۆ چی وای لێ هات
زۆر نەچووپاش (صـــلاحی) ئەیوبی
کـــورد کـــەوتە دەوری مـــەنکوبی
چ عـەشـیـرەت چ ئەهلی شـارسـتـان
لە هەمـوو تول و عـوورزی کـوردسـتـان
بوونە یەخـسـیـر و نۆکـەری ئەم و ئەو
باری خـەڵکی دەبەن بەڕۆژ و بەشـەو
لەسەر ئەو حاڵەش یەکتری دەکوژن
خوێنی یەکدی میسالی شیر دەمژن
دەرحـــــەق یەک ئەوەندە زۆر دەوەرن
کـەلەکـەی یەک بەشـیـری دەم دەبڕن
بە زگێ تێـــر بە دوو زگـــان برسی
هیچ لە چاکـــە و خـــراپە ناپرسی
جاهیل و بێ کـەمال و شەرمی حزور
ئەبغەزی خەلقی خوا فەقیر و فەخور
حـەیفـە بۆ غـیـرەتی سـەلاحـەدین
ئەو کـەسـانە بڵێن ئەمـەش کـوردین
وا مـەزانن کــە مـیـللەتی کــوردی
بە زەلـیـلی بژیت و نـامـــــەردی
ئەوی کـورد بێ لە نەسلی باب ئادەم
ئیشـەکی تورک وگوی درێژی عـەجـەم
حـەز دەکـەی پێت بڵێم چیـە کـوردی
عـاقـڵی و چاپوکی و جـەوان مـەردی

میللەتێکە لە فەوقی تورک و عەجەم
ساحیبی حەزم و رەزم و بەزم وکەرەم
لاوەکان قەدری نەسلی خۆ دەگرن
پیرەکان با لە زیللەتا بمرن
خاسەنەو باوەکانی مەکتەبی کۆ
دەبنە پشت و پەناهی میللەتی خۆ
ئێوە ئەولاد و جەرگ و ناوی منن
ئێوە نوری گلێنەی چاوی منن
عومری خۆتان مەبەن بە خۆڕایی
تێبکۆشن بە عیلم و ئازایی

## لای لایێ

ئەوەڵ چشتی دەچێتە گوێی منداڵ لە ناو لانکی
گەر چاکە گەر خراپە، لای لایەی دایکی
لای لایێ رۆڵەکەم بە رۆح خزمەتت دەکەم
تا خزمەتی مەفتەن کەی بە ئازایی و چاپوکی
ئەوەی بە دڵ و بە گیان خزمەتی مەفتەن نەکا
لەسەر جێگە و رێگەی خۆی دوژمن دێ دەری دەکا
ئومێدم وایە لاوە ئەتۆش هەر وەکو کاوە
لەبۆ کوردان هەڵ بکەی رایەتی ئەتابەکی
لاوژەم لای لایێ ئەتۆش هەر وەکو دایێ
ئەوشۆ کە خەوت نایێ، لە خەفەتی دنیایێ
منیش ئەوا دەگریم رۆڵە لەبۆ قەومی تۆ
هەموو جەرگ و هەناوم ئەوا هاتە سفت و سۆ
کوڵی گریانم هەستا، دین و دنیامان فەوتا
روومان لە هەق وەرگێڕا بە قسەی شێخ و مامۆستا
روومان کردە زەوایان، بوینە دەروێش و سۆفی
بۆیە ئێستێکە دووژمن وەک سەگ هەڵمان دەگلوفی
بەقسەی وانی حیلە باز رۆڵە ئێمە تێکەوتین
لەبۆ (قووتی لایموت) خەریکی بەڕو جەفتین
ئێوە بۆ خاتری خوا نەکەن هەڵبخەڵەتێن
دەنا وەڵڵا وە بیلا بە جارەکی دەفەوتێن

## ئاهو ناڵە

هەتا دەمـــرم لە بۆکـــوردان دەناڵم
عـیـلاجـیـان چۆن بکەم هاوار بە مـاڵم
بە زۆری جـــاهیـل و نەخـــوێندەوارن
لە لای نەوعی بەشـەر بێ قەدرو خوارن
کـەسێ قـەدری لە لای خزمـان نەمـێنێ
لە لای بێگانە قــەدری چی دەمــێنێ
لەگەڵ یەک بەد رەوشت و بەد نێـهادن
لە بۆیە وا کـــەســـادو بێ مـــرادن
لە عـیلم و مەعریفەت دوورن بە کوللی
خـەیاڵی خـاوە لایان فکری مـیللی
حـــەســـودن بۆیە بازاڕیان کــەســادە
نەزانن بۆیە تاعــەتیــان فــەســادە
لەسـەر عـەردی ئەوی کـوردی زوبان بێ
دەبێ زەباڵ و کــەنـاس و ســـەپان بێ
دەبێ حــەمـــاڵ و گـــاوان و شـــوان بێ
لە لای وایە دەبێ ســـوک و نەزان بێ
دەبێ هـەر ریش درێژو پـان و لـول بێ
دەبێ هەر عــاجـز و گـرژ و مـەلول بێ
دەبێ هەر بەندەی ڕۆم و عـــەجـەم بێ
دەبێ بێ عیلم و بێ ئیملا و قەڵەم بێ
ئەوەندە بێــهـــۆش و بێ دین و نەزانە
لەلای وایە خـــودای وی ریشی پانە

مەلاکانیش لە حەقیان زۆر خەیانن
ئەوانیش هەر دەڵێی گەوج و نەزانن
لەباتی باسی دین و روکنی ئیمان
مەلا بۆیان دەخوێنێ مەتحی شێخان
ئەڵێ شێخێ هەیە ساحیب کەرامەت
تکاتان بۆ دەکا رۆژی قیامەت
شەو و رۆژێ بە زیکری خوا خەریکە
دیارە زۆر لە خزمەت خوا نزیکە
گەلێ جاران دەچێتە فەوقی عەرشی
ئەگەر حەز کا لە لای خوا دادەنیشی
خولاسە چەند خەرافاتێکی دیکە
مەلا نەقلی دەکا بەو فاک و فیکە
عەوامی قوڕ بەسەر وا دەزانن
جەنابی شێخ بە خزمی خوا دەزانن
خسوسەن وەک دەڵێن یا غەوسی (اعظم)(٤٨)
چ وەهمێکی دەداتە زیهنی عالەم
ئەوانەی شێخیان لایان خودایە
حسابی وان لەسەر تەوقی مەلایە
مەلا تۆ باسی خوایان بۆ بفەرموو
وەها چاکە لە بۆ وان و لەبۆ تۆ

---

٤٨- غەوس: مەبەستی لە شێخ عەبدول قادری گەیلانیە زانایەکی بەرزی ئاینی بوو لە ٤٧٠ ک لە شاری (نیف) کە سەر بە گیلانە هاتۆتە دونیا رێگایەکی تایبەتی لە (تصوف) داهێنا کە هەر بەناوی ئەویشەوە پەرەی سەندو ناسرا، ئێستاش تەکیەکەی و کتێبخانەکەی کە گۆیا «٦٠» هەزار کتێبی تێدایە لە بەغدا ماوە...

## هەتا شێخێ بمێنێ

هەتا شێـخێ لە کـوردسـتـان بمێنێ
ئومـێـدی زیندەگـانیت پێ نەمـێنێ
تەریقی قـادری و نەقـشـبـەندی
بەبای دا رەونەق و ئاهەنگی کـوردی
هەموویان بوونە سۆفی و پیرو دەروێش
بە بەرمـاڵ و بە سبـحەو رشتەو ریش
هەمـوو بێ ئیش و بێ کـارو تەوەزەل
وورگ پان و مل ئەستـور و سـەلک زل
لەوان و ئەرز رۆم تا حـەدی جـافـان
تەوەڵابوون لە عـەقڵ وعـیلم و عیـرفان
بەوی شـۆلی بەوی عـەقڵ و تەمیـزی
مـحەقـەق قـەومی کـورد نایێـتە رێزی
بە ریشی پان و پرچی پڕ لە ئەسـپێ
بناغـەی ئیشی کـوردان چۆن دەچەسپێ
بە کـەشکۆڵ و سواڵ و فـەقر و زیللەت
مـحاڵە کـاکی خـۆم تەشکیلی دەوڵەت
هەمـوو بێ هۆش و بێ گـۆش و نەزانن
ئیدارەی مولک و میللەت چۆن دەزانن
ئومێدتان قەد نەبێ کورد ببتە دەوڵەت
لە بەدبەختی ئەوێستـا بۆتە سێ لەت
ئەوی زانایە ناو جـەرگی پەلاسـە
ئـەوی نـادانـە نـازانـی چ بـاسـە

جەنابی شێخ دەڵێ ئاخیر زەمانە
قیامەت رادەبێ هەر بەو زوانە
ئیرادەی خوایە ئێوە هەر وەهابن
وەکو هاروت و ماروت[٤٩] بن سەرو بن
بەڵێ یا شێخ قیامەت لیمە رابوو
بە جەهل و تەمبەلی خانەن خرابوو
لەبەر قەولی پڕو پوچی ئەمانە
لەدەست کوردان نەما غەیری هەمانە
لەبەر تەزویری وان شێخانی بەد بەخت
گەلی کورد نابنە ساحیب رایەت و تەخت
لەبەر چی کاری خەڵکی وا دروستە
ئەگەر هێندۆزە گەر ئاگر پەرستە
ئەگەر لازە ئەگەر رۆمە ئەگەر جوو
لە ژێر دەستی ئەم و ئەو پاکی دەرچوو
ئەگەر راستە دەڵێی دنیا خراوە
ئەدی بۆچیتە ئەو ئاوو بەراوە
ئەگەر دنیا خراپە بەو نزیکە
جەنابت بۆ بە دنیا وا خەریکە

---

٤٩- هاروت و ماروت: ناویان لە قورئان سورەی (بقرە) هاتووە کە دوو فریشتە بووین هەندی زانا دەڵێن دوو جادوکەر بووین سیحر و ئەفسون و جادوویان لە ناو خەڵکا بڵاوکردۆتەوە لە ئەنجاما لەناو چووین...

## ئەگەر عیزت دەویٚ

ئەگەر عیزت دەویٚ هەستی بە هیممەت
بەفکر و سەبر و تەدبیر و کیاسەت
ئەبیٚ میللەت هەموو یەکبن لەگەلْ یەک
لە ئەربابی قەلەم تا خاوەنی چەک
ئەگەر کوردیٚک ئیهانەت کەن لە بەسرە
هەموو بیٚنە خرۆش و جۆش و نەعرە
هەتا حەققی نەسیٚنن رانەوەستن
لەبەر بیٚ ئیتیفاقی خوارو پەستن
خەزیٚنیٚکو هەبیٚ مالّی عمومی
وەکو جوو ئەرمەن و بۆشناق و رۆمی
لە لیرەو رۆپیەو چاریٚک و غازی
بەکەلْکتان دیٚ لە رۆژی پەنجە بازی
فڕیٚی دەن مونتەشا[50] وبەرمالْ و کەشکۆلْ
تەرک کەن تەبلْ و رەقس و خدمەت و شۆلْ
وەکو شیٚر وەرنە مەیدانی جەرائەت[51]
بە غیرەت بن بە غیرەت بن بە غیرەت
تفەنگ و تۆپ و تەیارە پەیا کەن
بە عیزی دین و دونیا روو لەخواکەن
پیاوی ترسنۆک وەک پوشکە سووکە
ژنی بیٚوە بە کورکەو نوکە نوکە

---

٥٠- منتەشا: تەوریٚکی بچکۆلەیە دەرویٚش هەلّی دەگریٚ...
٥١- جەرائەت: واتە ئازایی...

سەحابەی رەش ئەوا قەبری دیارە[٥٢]
مەسافەی سێ سەعات دووری لە شارە
سەحابەی موستەفا گەر ترسنۆک بان
چ ئیشیان بوو لە تورکستان و ئێران
نەکەن خۆفێ نەکەن ترسێ لە هیچ کەس
بە غەیرەز خالقی دەوواری ئەقدەس
دەبێ بێشک و شوبهە وابزانی
بە تەحقیری حەیاتە زیندەگانی
ئەوی دونیای نەبێ دینی زەعیفە
مەلا بێ یانە شێخ بێ یا خەلیفە
مەداری دین و دونیا هەر غینایە
بەڵێ (الفقر فخری) ئیفتیرایە
هەوای گەورەیی دەرکەن لە نێو سەر
بەبێ تۆپ و تفەنگ و ماڵ و عەسکەر
موحەقەق تا قیامەت نابنە بەگ لگ
ئەگەر هاویو نەبێ یان ئۆن ئیکی لگ
بە غەواسو بە پاپۆڕ و زرێلی
{بە باڵۆن و بە دۆغای زرێلی} [٥٣]
لە دنیا هەرچ بێ کوردی موحەققەر
بە بێ پارە لەبۆت نابێ مویەسەر

٥٢- مەبەستی گۆڕستانی دۆڵی ئەسحابانە لە نزیک گوندی سماقوڵی. شەڕێکی خوێناوی لە نێوان سوپای ئیسلام و دانیشتوان روویداوە، گۆڕی کوژراوانی بەرگری ناونراود (سەلکی کافر!!) ئەوانی تر بە (ئەسحابە) ناسراون، یەک لەوان (مەغدیدی ئەسودد) بە ئەسحابەی ردش ناو دەبرێ.
٥٣- ئەم دێرە شیعرە ناتەواوە بۆمان ساغ نەبۆوە.

وولاتێکتـان هەیە پڕ کـان و مـەعـدەن
به بێڵ و پێــمــەرە دوو قــوڵتی لێــدەن
دەزانـن نـاوی ئـەرزی چی تـیـــــایـە
وە لێ مــەوقــوفی عــیلمی کــیــمــیـایـە
هەتا ئەو عــیلمــە چاکی نەخــوێنن
دەبێ هەر پـاقـلـەو سـلـقێ بـچـــــێـنن
مـەلای نادان بە عـینوانی شـەریعـەت
حــەرامی کــرد لە تۆ عــیلمی تەبیــعــەت
لە بۆیە هەرچی لەو خـاکە بەدەرکەوت
لــە رادیۆم و لــە زێــڕ و بـاقـــــــرو نـەوت
هەمووی کەوتۆتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیـــــاو چۆلان دەنۆڕن وەک پڵــــینگان
تەمــاشـاکــەن چیـایان چۆن دەکــۆڵن
هەتا کـــەی ئێـــوە هەر بەرمــاڵ بەکــۆڵن
خـوری و مـازی و کـەتیـرەو چەوت و گـروان
وەکـو سـیـچکەو گلێـخـەو رۆنی قـەزوان
دەخـیلویم نەکـەن بیـدەن لەدەست خـۆ
وە ئـیـــــــــــلا وا بـزانـن رۆح و دەرچـو
هەتاکـــو نەبنە خـاوەندی ســەنائیع
هەمــوو ئینعــامی خــوادەروا بە (ضــایع)
بە خـۆڕایی دەچی عـومـری عـەزیزتان
بە هاوین و بەهارو پایز و زســـتـــــان
مــەچوونە خـانەقـاو و چایەخـانان
ئومـــێـــدم وایە ببنە خـــانی خـــانان

ئەگەر خواهیش ئەکەن خواڵیبوبی رازی
مەچوونە تەکیەکان بۆ حوقە بازی
قوماری قەت مەکەن ئێوەو خوداتان
دەنا بەرباد دەبێ ماڵ و مناڵتان
بەجێی بێنە ئەوەی واجب کرایە
بەوی نەوعێ کە مەتلوبی خودایە
ئەگەر باب جاهیلە باکور مەلابێ
لە ئەحوالی ئومەم تا شارەزابێ
سیاحەت کەن بچن بۆ چین و ژاپۆن
ئەمیستا چین لەپێشانیش چلۆن بوون
چ ناوێکیان نەبوو (بین الخلائق)
ئەمیستا بۆچی بوونە (شەمسی شارق)
لەگەڵ رووسێکی وا زۆر و بەقووەت[٥٤]
شەڕی کردو چلۆنیش وا بەسەرکەوت
چ ژەهراوێکی دایە دوبی ئەکبەر
شکاندی سەتوەتی سوڵتانی قەیسەر
لە دونیادا هەر دەبێ کوردی بەدفەڕ
نەبێتە خاوەنی (دەیهیم)[٥٥] وئەفسەر
لەژێر کەوتوو رەزیلی کوللی میللەت
بەلای لێدا ژیانی وا بە زیللەت
نەمان خوێند و نەمان دیت و نەمان بیست
عەلەم داریێ لە نێو کوردان هەڵستێت

٥٤- جەنگی ژاپۆن و رووس لە ١٩٠٥ روویدا، ژاپۆن سەرکەوت و چووە ریزی دەوڵەتە گەورەکانەوە.
٥٥- دەیهیم: واتە سامان.

ئەتۆ ئەی مامە کوردە پێم بڵێ چیت
کەڵاش خوار و کراس دڕیاو کەوا چیت
کەپو قیچ و لچ ئەستوورو ددان گڕ
کوت و کوڕ و کەڕو گێژ و سەلک خڕ
هەتا دەمری بە خواری رادەبوێری
بەبێ بەختی و بەبێ دەستی و فەقیری
بە جان و دڵ لە رەبی خۆت دەخوازی
زگت پڕ بی لە ئەستورک و پیازی
بە کوردی پێت بڵێم ئیشت شلۆقە
دوای چی کەوتووی بەو گورگە لۆقە
گرینی من لە بۆ تۆیە وە ئیلا
تەماعم پێت نیە حاشا وەکەللا
ئەتۆ چۆنی بژی من هەر مەلامە
ئیتر بەسیە برام خەتمی کەلامە

## هەستە پێشکەوە

هەموو نەتەوەیەک هەقی هەیە بە زوبانی خۆی بخوێنێ و بنوسێ، جەلیزادە لەبەر دەرکی سەرا روو بە رووی کاربەدەست و مامۆستاو قوتابی و حەشاماتێکی زۆر ئەم شیعرە دەخوێنێتەوە کە دووەم شیعری نیشتیمانیە.

**هەستە پێشکەوە ئەی لاوی کۆیی**
**ئاگات لەخۆ بێ کاروان رۆیی**
**بە نوری عیلمی رێگا بەدەرخە**
**بەزۆری باز و باری بەسەرخە**
**بە باڵی عیلمی بفڕە وەک تەیران**
**بە هێزی عیلم هروە بن بەحران**
**عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە**
**(قال) و (قول)[٥٦] گشتی هەبایە**
**عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە**
**بەخوا نازانی خوا چی کردووە**
**عیلمی حیکایەت گەر کەڵکی هەبا**
**دەبایە دنیا هەمووی بۆ مەبا**
**ئێمە پابەندی وەهم و خەیاڵین**
**ئێمە خەریکی کەری دەجالین**
**عیلمی صنایع لای ئێمە نیە**
**گەر چشتێک هەبێ ئەویش قەولیە**
**پەنیر و ژاژی شیرێژ و لۆرک**
**نەتیجەی عیلمی کیمیان بەبێ شک**

---

٥٦- قال و قول: مەبەستی (صرف و نحو)ی عەرەبیە.

بەگـلـی ســــــــپـی لـە ئـاوی تـری
دۆشـــاوی شـــیـــرین چلـۆن دەکـــری
کـــاردی وەک کـــێـــردی زوبـان دەبڕی
بە ترشی ســمـــاق ژەهری چۆن دەمـــری
عـیلمـێکی گـەورە لەناو کـوردان بوو
بە قـــســەی پڕو پوچ لە کـیـســمـان چوو
بە دەف و دەمـبـەک بە رەقس و سـەمـا
عـیلم و مـەعـریفـەت لای کـوردان نەمـا
بەخـوا زۆر حەیفە...حەیف و مـخابن
مـــیللەتی کـــوردان هەتا کـــەی وابن
جـــەهالەت بڕوا دەوری عـــیـــرفـــانە
کـــــــۆزر بـابڕن نـۆرەی کــــــــوڕانـە
ئەی لاوی کـــۆیـی نوری دوو چاووم
قـــــووەتـی دڵـم جـــــــەرگ و هـەنـاوم
باوانی بابم نەوباوەی مـــەکـــتـــەب
بە عـــەقڵ و عـــیـــرفـــان بە عـــیلم و ئەدەب
بە ئەخـــلاقی چاک بەدین و ئـیـمـــان
بـە رێـک و پـێـکـی وەکـــــــو بـرایـان
لەگـــەڵ یەکـــتـــری وەک روح و بەدەن
ئـیـمـــتـیـــزاج بکەن بۆ عـــیـــزی وەتەن
ئێـــوە بۆ مـەفـتــەن ئەولادی (صلبی)
خـــــوا تەوفـــــیق و دا ئامـین.. یا رەبی
هیچ فـەرق و ناکـەم لەگەڵ مـەسعـودی
خـــوا چەپارەودا لە چەنگ حـــەســـودی
مـەجـیـد و سـەلاح لام وەکـو ئێـوەن
ئـێـــــــــوەش بـرازان پـێـم بـڕوا بـکـەن

## ئاواتی دوا ڕۆژ

زۆر بووە بەرخـــــەکی لەڕوو لاواز
بویتــە خــرتێکی دونگ زەلام و قــەڵەو
یا منالێکی ســیس و مـــردۆخــە
بوویتــە مـەردێکی گــورج و گــۆڵ و پتــەو
گـەلێ مـیللەت وەها بەسـەرکـەوتن
کـــە نەیەتە خـــەیاڵ و هەم و خـــەو
بۆیە ئومـێـد دەکـەم لە لوتفی خـودا
خـــالقی مـــانـگ و ڕۆژ، ڕۆژو شـــەو
کـوردەکـانیش بکاتە ساحـێبی جـا
(سـنــة الــلــه فــي الــذيــن خــلــوا)
تەلەفـــۆنی بخـــاتە ناو کـــوردان
بـانـگی یـەکـــــدی بـکـەن دەنـگی هـەلـەو
هەو هەوی کـــوردەکـــان لە مـــەیدانی
زەل زەلەی خـاتە مـولکی کـەی خـوسـرەو
بێـتــە ژێر دەســتی مـیللەتی کــورد
هەر لە (باطوم)[٥٧] هەتا وەکــو دەهلەو[٥٨]
بە نەزەڕ تۆ خــــودایە ئاســـــانە
باز و شـاهێن هەڵێن لە قــاسـپـەی کـەو

---

٥٧- باطوم: بەندەرێکی وولاتی گورجستان - جورجیا - کەوتۆتە سەر بەحری ڕەش.

٥٨- دەهلەو: ناوی کۆنی شاری دەلهی پایتەختی هیندستانە کە زۆر زانای ئاینی ئیسلامی لێ هەڵکەوتووە بە ناوی (دەهلەوی) ناوبراون.

## دەڵێن باران بە ئەمری شێخ دەباری

دەڵێن باران بە ئەمری شێخ دەباری
بە ئەمری کن (فکان) وەک ئەمری باری
خولاسە کافەیی زەرراتی عالەم
چ ئەفلاک و چ ئەملاک و چ ئەنجوم
بە ئەمری حەزرەتی پیرە دەوامی
حەیات و مەوت و تەرتیب و نیزامی
مەلاین گەر بڵێ نابێ وەها بێ
دەڵێن ئەو فاسیقە بویتە وەهابی
ئەری ئەی شێخە پیسی بۆری چڵکن
ئەری ئەی زگ هەمانەی غازی بۆگەن
ئەتۆ دەواری چەرخی بێستونی
ئیرادەی تۆیە تەنزیی شوئونی
ئەری ئەی شێخە کۆری خواری مەخزوم
ئەتۆی نایب مەنابی حەیی قەیووم[59]
ئەتو ئەی پیستە خۆری لینگ گواوی
لەگەڵ زەرڕاتی عالەم تێکەڵاوی
ئەتو مومتازی رزقی مارو موری
ئەتۆ ئینشاکوننەدەی نارو نوری
بە حوکمی تۆ دەبێ عەفوی گوناهان
وەکو پاپای نەسارا خێوی غوفوران

٥٩- واتە خەلیفەی خوداو پێغەمبەر.

هەمــوو عــالەم لە ژێر فــەرمــانی تۆیە
حــەیاتی تۆ بە مــــســـتــــەک ئاردی جــۆیە
ئەوی عــەفوی بکەی جێگای نەعــیمــە
ئەوی عــەفــوی نەکــەی مــەئوای جەحــیــمــە
ئەگــەر مــولکە هەمــوو مــولکی خــودایە
ئەگــەر شـــێــــخـــە ئەگــەر قـــوتبـــە هەبایە
ئیــرادەی قــودرەتی خــوای من تەواوە
چ حـــــاجـــــەتمان بە شـــــێخ رایی کــــراوە
بە ئەقــتــاب و بە ئەوتاد و بە ئەقــوال
نەبوونە ئادیســـۆن[٦٠] ئەی مـــەردی بەتاڵ
لە عـیلم و ئیـختـیـراع چی بەدەرخست
بڕۆنە... میللەتی خۆی چۆن بەسەر خست
بە عــیلمی کــیـمـیــا و قــووەتی نوور
بــە تــەیـــارەو بـــە زەبــلـــین و بـــە واپـــۆڕ
چلۆن قوتبی فەقیریان پێ نیشان کرد
پڕۆژەی شێخ ئەفـەندیشـیـان عـەیان کـرد
مـــسلمـــانان لە چەنگ وان کـــو زەلیل بوون
دە فـەرمـوو شێـخە شێـتی گـێژ و مـەجنون
بزانم تۆ ئەوێســـتـــا چیت لە دەست دێ
لە بەحــــــر و بەڕ و چۆڵ و شـــــــار و لادێ
وەرن ئەی ئومــەتی (خــیــر البــریة)
لەپاش تەقــدیمی (اخــلاص) و (تحــیــة)

٦٠- ئەدیسـۆن: زانایەکی ناوداری بەرزی ئەمریکی بوو کـاردەبای دۆزیەوە ئەوەش بوو بە هۆی بەرپا بوونی شـۆڕشـێکی زانیـاری لە جیـهـاندا، جگە لەوەش زیاتر لە هەزار داهێنانی لە پیشەسازی دا هەیە، لە ساڵی (١٨١٤-١٩٣١)ز ژیاوە.

به عیلم و عەقڵ و هۆشو فکرو عرفان

به قــەولی مــوســتــەفــا و ئایاتی قــورئان

بزانن ئەو قــــســــــانه پاکی پوچن

ئەگــەر خــوامــان هەبێ ئەقــتــاب لەبۆ چن

به قــەولی جــاهیــلان خــۆتان مــەگــۆڕن

بــه چــاوی دڵ لــه دونــیــــــــــایێ بــنــۆڕن

له ژێر ئەرزی هەتاکــــو ژوور و ژێروو

له مــــانگ و رۆژ هەتاکــــو مــــار و مــــیــــرو

به (کم) و (کیف) و وەزع و چەند و چوونی

بــه (اطــوال) و بــه ئــەدوارو ســکــونــی

گــــەلاوێژ چەند زەلام و چەندە دووره

ســــوها تاریکه یاخــــود زۆر به نوره

(ضــیــا ء) چۆنه له چی تەرکــیب کــرایه

نیــزامی ئەو عــــالەمــه چۆن داندرایه

به چی دەکــرێ به کێ دەکــرێ ئیــداره

له بۆ کێ دێتــــه تەعــــداد و ژمــــاره

به غــــەیرەز قــودرەتی داواری جــەبــبــار

به غــــەیرەز پادشــای خــەلاق و قــــەهار

به قــــــودبێکی زەعــــــیف و ناتەوانه

ئیــدارەی چۆن دەبێ ئەی مــەردی دانه

ئەوی لای ئێــــــوه داواری ئــمــــــورن

لەبەر دەستی خــوا کــەمــتــر لەمــوورن

کەسێ ئیمانی به خوا و قــودرەتی بێ

چلۆن ئەو ئیعتیقادەی دەچێتە قەلبێ

تێبینی: (اطوال) به عەرەبی واته درێژی و پانی. هەروەها (ضیاء) واته رۆناکی.

# ئەم میللەتە

ئەم میللەتە بەد بەختە کە قەومی کوردن
ئەی وای لە ژێر نیری ئەجانیب مردن
هەرچەند کە مسوڵمانن و ئەهلی سونەن
بلعاتی مەشاییخ بە قوڕی دا بردن
ئەم میللەتە وا بە مەکری شێخی گومرا
نەعیزەتی دینی ما نەعیزی دونیا
ئێستێش بە فڕو فێڵی ئەوان تێدەکەون
(لا حول ولا قوة الا باللە)
بۆ خاتری خودا موجەدیدی ئەلفی دووەم [٦١]
جارێکی تەماشاکە لە رووی لوتف و کەرەم
لەو ساوە کە تۆبووی بە موجەدیدی ئومەت
بوون بە ئەسیرو ژێر دەستی کوللی ئومەم
ئەم تائیفە مومتازە کە گویا نەقشین
موستەغرەقی یادی خوان لە عالەم وەحشین
با ووجودی کەباراش دەبا بۆ ئاشی
هیچی لە دڵا نیە بە غەیری کەری شین
ئەو حەرزرەتە وەک نان و پیازی دەبڕی
نێزیکە لە تاوان رەگی جەرگی ببڕی
هەر چەندە کەرامەتی وەکو سەگ دەوەڕی
بیچارە لە بۆ مستە بڕۆشێ دەگەڕی

٦١- موجەدیدی ئەلفی دووەم: مەبەستی لە شێخ محەمەد عەبدی میسریە کە ئاینی ئیسلامی بە جۆرێکی نوێ لە خەڵکی میسر دەگەیاند...

قەومێ کە بە ناوی دین و ئیمان دەگەڕێن
گۆیا کە لە بۆ خەلاسی ئینسان دەگەڕێن
کەزاب و منافق بەدو بێ دین
وەک ئاش بە تەماعی ساوەرو نان دەگەڕێن

خالقی ئەرزو سەما عیسایە
بە خودا ئەم قسە بێ مەعنایە
کەسەکی هۆشی هەبێ وانالێ
چۆن دەڵێ وایە ئەوەی دانایە

گوێ بگرە لە جەنابی پاپی ئەعزەم
گویا کە خودا وەندی کەریم و ئەرحەم
خۆی خستە زگی حەزرەتی خاتو مریەم
تا ببێتە کەفارەتی گوناهی ئادەم

پاشان لە زگی خاتو مریەم هاتە دەرێ
چەند کەشمە کەش و هەرای هاتە سەری
تا ئاخری کار لە دار درا خودای عالەم
تا هێستە لە قەبری هاتە دەرچۆتە سەری

خۆزی کە نە ئادەم و نە حەوا بایە
سەد خۆزی نە عیسا و موسا بایە
هەر هەشت تەبەقەی بەهەشت بسوتایە
ئەو قسە پڕ و پوچە نە گوترا بایە

قەولێکی درۆو فاسیدو بێ ئەسڵ و ئەساس
خارج لە عەقلی عیبادو مقیاس و قیاس
چۆن دەچتە زگی مریەم خودای بێ هەمتا
دەک لەعنەتی خوا لە روحی پاپاو شەمماس

## سێ برام هەن (٦٢)

سێ برام هەن ئەمن برا چووکم
لای براکانی خۆم گەلێ سووکم

ئەو برایانە زێدە غەدارن
زاڵم و بەد رەوشت و بەد کارن

بە برا گەورەکەم دەڵێم کاکە
تۆ بە چاوی کەرەم تەماشاکە

من هەتیو بوم فەقیرو بێ دەسەڵات
چی بەرم کەوت لە دەوڵەت و ماڵات

---

٦٢- بەداخەوە هەر ئەوەندە لەم پارچە شیعرە ماوە بۆ یەکەم جارە بڵاو دەکرێتەوە..

# ئامۆژگاری

قـــســـێکت بۆ دەکـــەم راســـتی بزانە
قـــبـــولی کـــە بەبێ عـــوزر و بەهانە
بەســـەر زارو زوبانان گـــەرچی ســـوکـــە
لە مـــیـــزانی حـــەقـــیـــقـــەت زۆرِ گـــرانە
بە خـــێـــری خـــۆت بە خـــەڵکی رابگەیێنە
هەتا زاهیـــر بێ ئەو ســـیـــری نیـــهـــانە
هەتاکـــــو ئەهلی شـــــارو دەشت و لادێ
خـــــەبەر دار بن لە ئەحـــــواڵی ئەوانە
بەخـــــۆت ئەحـــــواڵی لادێ چاک ئەزانی
یەکێ جـــوتـیـــــارە ئێکێ بەرخـــەوانە
ئەمی ئاودێرە ئەویان عـــارد ئەکـــێـــڵێ
شـــوانە ئەم ئەویـتـــریان ســـــەپانە
خـــەریکی کـــارو بارو جـــۆت و شـــۆنە
لە فـــێـــڵی فـــێـــرکـــەران ناشـــارەزانە
مـــەلایەکـــیـــان هەیە سندانی لێـــدا
نەخـــوێندوو و ئەحـــمـــەق و پوچ و نەزانە
وەکـــو کـــەر گـــرِ نەخـــوا دایم لە دیدا
بە ریشی پان دەڵێی مـــاڵمی جـــوانە
ئەویش بۆ شێخ وەکـو کـەلبی مـوعـەللەم
بە دەم کـــەرویشکی بۆ دەگـــری لەلانە
ئەویش وەکـو سـەگ لە دوو شـێخ ئەنۆڕی
لەبۆ شـــێخ ئەبێـــتـــە بەزمی زەمـــانە

وەرن تۆبە بکەن لای شێخ بە تەعجیل
قیامەت رادەبێ هەر بەو زوانە
بە مام کێخوا بڵێ ئەسبابی رێکخا
لەبۆ شەو شێخ دەێتە دیواخانە
دەزوو چێشتی لە بۆ شێخی دروست کەن
پلاوساوار و شلکێنەو کەلانە
کە نێزیکی سەعات دوو بوو دەڵێن
ئیتر بەسیە ئەوا نۆبەی ژنانە
ژنی کێخواو ئەهالی دێنە جەزبە
ئیتر هاوارو گریان و فیغانە
لە پاش ئەو های و هۆیو هات و باتە
دەڵێ ئەی قەومە گەل کۆکەن ئیعانە
مریشک و هێلکەو جوستیرو کاور
کەرەو داندۆکو ساوارو هەمانە
گوریس و کۆتک و ناودۆکو مەشکە
جوال و تورەگەو تیرۆگو خوانە
ئەڵێن قوربان گەلێ کەسر و کەسادین
بەخوا تەخمینەکەشمان زۆر گرانە
بەخۆت نەت دی لە نیسان قوڕ دەباری
کلۆش هیچی نەهێشت وا لێت عەیانە
جەنابی شێخ دەچێ بۆ دێیەکی دی
بە سەد دەردی سەری و حیلەو فسانە
یەکێ عاقڵ دەڵێ (یا أیها القوم)
لە کەید و فێڵی شێخ ناشارەزانە

لەمن مـەعلوم بووە بێ شـەکک و شـوبهـە
بە ئەتوارو بە ئاســـارو نیـــشــــانە
ئەهەمی مـەقـســەدی شـێـخی زەمـانە
لـە ئەم دەورو عـلـیـکـە نـان و گـــــانـە
ئەوەندە دوور لە دین و دوور لـە خــــوانە
خـــســـوســـەن وەک ئەچن بۆ خلوە خــانە

## مەهدی دێتەدەر

مـــەهدی دێتــە دەر وەک بڵـــقی ئاو
دونیــا دەگــری بە دوعـــا و ســـڵاو
پف چەندە خۆشـە ئەوجـا مـامـۆستـا
هەسـتــە لە خـەوی تاڵعت هەسـتــا
چەنـد دێت[٦٣] دەداتێ بـە ئاوو بـەراو
ئەوجــا تێـر بخـۆ لە مــاش و سلقــاو
دەبی بەقـــازی بە شـــێخ الاســـلام
جـــەبرەت دەداتێ جـــەبرەکی تەمـــام
مـــــــوچەت دەداتێ تـا دەبی رازی
ئەوجـا بیـست روپیـە یان پازدە غـازی
ئەوجا (حەیفی) خۆت لە کێخوا بگرە
ئەوجـــا کـــێـــخـــوا ژن لە دەردان بمرە
دێتــە خـەیاڵت ئەی مــخــتــار باش
کــــــەرت نەدامێ پێ بـچم بۆ ئاش

---

٦٣- چەند دێت دەداتێ ، واتە: چەند گوندت دەداتێ.

## منیش هەر وەکو غاندی

منیش هەر وەکو غاندی[٦٤] — هەناسە ساردو ماندی
لە قەومی کوردو هیندی — هەرچی خێربوو نەماندی
چەندی لە قەومی کوردی — تێدە فکرم بە وردی
بە هیچ وەجهێکی نەمدی — ئاساری ئیتیحادی
قەومێکی وا لەیەک دوور — بێ رابیتەو بێ شعور
تاڵ و تیژ و تفت و سو — خۆ بە خۆیی ئەعادی
نەبونە و نینەو — مەگەر جاوەیی وابن[٦٥]
سەد حەیف و سەد مخابن — بۆ سەلاح و ئەولادی
دەرحەق یەکتری دەوژمن — خوێنی مێشکی یەک دەمژن
بابو کوڕ یەکدی دەکوژن — لەسەر چشتەکی عادی
میللەتی بێ هۆش و گۆش — کەڵاش لە پێ نمد پۆش
خواردنی پولکەو برۆش — بە کفتەکی (حشاندی)
مەلایان بێ عیلم و ماڵ — شێخیان بێ کەشف و کەمال
ئاغایان رووت و رەجال — قوتەی مل نێرکە کاردی

---

٦٤- مهاتما غاندی: پێشەوای بەرزی نیشتمانی هیندی لە شاری بوربندر ساڵی ١٨٦٩ لەدایک بووە. شۆڕشێکی سیاسی دژ بە ئینگلیزی بەرپا کرد بە رێگەی (ئاشتی و ئاسایش) نەک لە رێی چەک و خوێن رژانەوە.. ساڵی ١٩٤٨ بە دەستی تاوان بارێکی چەپەڵ کوژرا.

٦٥- جاوەیی: مەبەستی خەڵکی دوورگەی (جاوە) یە کە لە وڵاتی ئەندۆنیسیایە.

## به تەما نیم لە میللەتی کوردی

به تەمـــا نیم لە مـــیللەتی کـــوردی
لەســـــەر ئەم ئەرزە پاشی چەندی دی
کـــەسـێکی وا بیـێـتـــە ســاحــبی ناو
خـــاوەنی ئیـــعـــتـــیـــبـــارو ئاو و بەراو
وەک تەفــەکـــور دەکـــەم لە فکری وان
هەر لە کـــۆوە هەتاکـــو مـــووشـــو وان
بەتەمـــامی دەڵێی هەمـــوو مـــردون
پاک لە خـــاکی مـــەزە لە تا روو چوون
هەمـــوو بەد خـــواهو دوژمنی یەگـــدین
با وجـــودی کـــە قـــەومـــەکن یەک دین
رونەســـایان بە کـــوللی بێ عـــیلمن
دزو قـــولاب و بێ حـــەیاو شـــەرمن
عــولەمــاکــانیــان هەر دەڵێی وەحشین
شــێــخــەکــانیــان بە حــیله وەک ریوین
پاک لەگــەڵ یەکــتــری لە دڵ پیــسن
بە فــرو فــێڵ و کــەیدو تەلبــیــسن
عـــەرەب و تورک و دەوڵەتی ئێـــران
دابەشـــیـــان کـــرد وولاتی کـــوردان
کـــوردی بێ تالع و فـــەقـــیـــر و رەزیل
دەربەدەر بوون ســەفــیل و خــوار و زەلیل
ســاحــێــبی مــوڵک و مــاڵی خــۆ نینە
قــوڕ بەســەر کــاســە لێــسی خــەڵکینە

گــــەرچی ئەمــــڕۆ لە خــــوتەی بابان
شــرکــەتێکیــان هەیە لەگــەڵ عــەرەبان
چەند کــەسێکیش بە ناوی کــوردســتــان
لە وەزیر و لە (نائب) و ئەعــــــیــــان
بەعــــزەکی فــــورس و بەعــــزێکی تورکن
بەعــــزێکی جــــاو فــــرۆشی زۆر چڵکن
بەعــــزەکی بێ کــــەڵاش و پێـــخــواسن
وەکــــو حــــەیوانەکــــانی پشت قــــافن
هەموویان کوێری دار بە دەست و بەستەزمان
قــوڕ بە ســەر قــەوم و قــیلی کــوردســتــان
نائیــــبی چی.. وەزیری چی.. هەیهــــات
ئاو وعــــەردمــــان هەمــــوو لەدەست دەرهات
لەســــەر ئەم زیللەتەش جــــەنابی شــــێخ
دەگــــەڕێتن بە تەپڵ و دمــــبک و مــــێخ
دەعــــوەتی خــــەڵک ئەکــــا لەبۆ تۆبە
دڵی پڕ ئاگــــــرە وەکــــــو ســــــۆبە
پیــــــرەژن دی بە خــــۆو چەند هێلکە
دەڵێ یاشـــــــــێخ دەچاوەکم لێکە
من ئومــــێدم بە هیــمــــمــەتی شــێخــە
ســـافــیــدات بم دە دەســــتــەکم رێخــە

## خۆزیا ئیمامی رازی

خـۆزیا ئیــمــامی رازی[٦٦] لەم عـەسـرە زیندوبایە
تا لە ســونعی بەشــەری تەیارەی بدیبــایە
ئەوجــا ئیــمــانی دەینا بە قــودرەتی بەشــەری
قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری
چونکە سلبی تەئسیـریان لە قـودرەتی عـەبدی کرد
ئومەتی وا بەقودرەتی گشتی بەزیندویی مرد
پاکیان بە دەف و دەمبک بە دوعا و نوشتەو کشتەک
مـەحروم بوون لە ئاسـاری سـونعی دەواری فـەلەک
رواهـو الدار قطني[٦٧] حــدثنا التــرمــزي[٦٨]
پاکی لە کیس ئیـمـە دا لە واپۆر تاکـو دەرزی
ئیـمـامی (مـاتریدیش)[٦٩] یەعنی (علم الهـدی)
چەند لە قودرەتی هات رێگەی لە ئێمە تێکدا
ئەوی کـە خـەلقی خوابوو لە مـەعـدەن و کـان ئەوت
هەمووی لە کیس ئێمە چوو بە دەستی کافران کەوت
بە ئومــێــدی ئیــمــامێن یەعنی حـەیدەری کـەرار
یاخو حەزرەتی عیـسا لە ئاسمان بێتە خوار
یانە مـەهدی مـوختــەفی لەنێـو چالی بێــتـەدەر
بە قـووەتی ویلایەت دونیـا بکا مــســەخـەر

---

٦٦- ئیـمـامی رازی: مـەبەسـتی لە محـەمـەد فـەخـرددینی رازی بووە لە سـالانی (١١٤٧-١٢٠٢) ژیاوە، فـەیلەسـوف و مـوفـەسـیـرێکی ناوداری قـورئان بووە، لەناو کـوردان بە(ئیمامی فەخری رازی) ناسراوە.

٦٧- الدار القطني: ناوی ئەبو لحـەسـەن ئەددارە قـوتنی بووە لە سـالی (٩١٧)ز بووەو لە (٩٩٠) مردووە، یەکێک بووە لە ئیمامەکانی حەدیسی پێغەمبەر.

٦٨- الترمیزی: مەبەستی لە (محەمەد کوڕی عیـسای ترمزیە لە سالانی (٨١٥-٨٩٢) ز ژیاوە لە شاری ترمزی تورکستانی لەدایک بووە. زانایەکی گەوردی (علم الحدیث) بووە.

٦٩- ئیمامی ماتریدیش: (ئەبو مەنسوری سەمەرقەندی) کە لە زانایانی زانـسـتی (الکلام) بووە، لەسالی (٩٤٤ز) کۆچی دووای کردووە، هاوچەرخی ئیمامی ئەشعـەری بووەو لە دژی موعتەزیلە وەستاوە....

## هەناسەی نەوتاوی

یا رەببی بە لوتف و جـود و ئیـحـسـان
لوتفـێکی بکەی لە حـەقی کـوردان
قـەومـێکی فـەقـیـرو ناتەوانا
بـێ پـەروەر و بـێ پـیـاوی دانـا
بێ مـورشـیـدو عـالمی سـیـاسی
بی (مـسطر) (قـاعـدەی) ئەسـاسی
بێ رووح و حـەیاتی ئیـجـتـیـمـاعی
بێ قـودرەت و قـووەتی دیفـاعی
بێ دەفـتـەرو کـاغـەزو کـیـتـابەت
بێ سنعـەت و حـیـرفـەو و کـەسابەت
خـاکـێکی هەیە وولاتی کـوردی
ئیکسـیـرە وەلێ لە چەنگی مـردی
خـاکـێکی ئەوەندە پاک و رەنگین
قـەومـێکی ئەوەندە فـەقـیـر و بێ تین
ئەی کـاکی نەفـامی گـەوجی مل هوڕ
بنوارە لە دەوری بابە گـوڕ گـوڕ
ئەو قـوەتە چی بوو چۆن بەدەرکـەوت
چۆن هەر دەکـوڵی مـەنابیـعی نەوت
ئەو نەوتە بوو ئاگـری هەڵای سـاند
چەند دەوڵەت و تاج و تەخـتی فـەوتاند
بۆ ئەو نەوتە بوو کـە چواردە ملیـۆن
عـەسکەر لە فـەرەنگ و نەسلی مـەیمون

بۆی هاته نزاع و حەرب و کوشتن
تاکو بە مەرامی خۆ گەیشتن
ئەو نەوتە چبوو... حەیاتی تۆ بوو
وەی خۆل بەسەر ئەویش ئەوا چوو
ئەی کوردی نەفامی خانە وێران
وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران
ئێستێکە گەلێ مەعادنی دی
پەنهانە لە ئەندەروونی عاردی
وەک مەعدەنی زێڕ و زیوو سەردەف
تۆش لێدە لە تەپڵ و دمبک و دەف
ئەو نەوتە لە خاک و موڵکی کوردی
کێ خستیە دەست و هات و بردی
هەر ئەیسە کە ئنگلیز و ئەفرەنج
پاش حەربەکی زۆر بە میحنەت ورەنج
بەو فیکری عەمیق و حدس و حسە
گەر بیتە شریکی نەفع و حیسە
ئەو نەوتەیە گەنج و ماڵی کوردی
بۆچی... پیس بردی
بیبات و لە نەوسی خۆی خەرج کات
ئەم کوردە فەقیرە چی بەسەر هات
ئەم میللەتە گەورە و عەزیمە
سێ پارچە کراوە بۆتە قیمە
قسمێکی لە جەوری تورکی غەدار
هاواری دەگاتە چەرخی دەوار

قــــســـــمــــيكی له ژێر نيـــری ئێـــران

ســــــــــوتـاوه هـەنـاوی بـۆتـه بـريـان

قـــسـمـێكی له ترسی سـووری چاوشين[٧٠]

كـــەوتۆته ليـــبـــاسی مــــاتەم و شين

دەوجـــا وەره ســـەيری ئەم حـــيـــســـابه

ئەم لالـه چلـۆن دەبێـــــتـــــــه يـابه

ئەم مــولـكه به قــيــمــەت و وەســيــعــه

بۆچی دەدری به كــــاكی شـــيــــعـــــه

قـــولتـــێكی له دەوری بابه گـــوڕ گـــوڕ

نايدەم به منارەكــــەی ئيــــمــــامی دور

بســــتێ له وولات و مـــــولكی كـــوردی

نايدەم به مـــەرقـــەدی (ســـەهرەوەردی)[٧١]

(نزرو) هبـــــەو (عـــــزا) دەمـــــێنێ

ســـەد مـــەعـــدەن و كـــانی نەوتی دێنێ

ئەم مـــوجـــتـــەهيـــدانه پاكی كـــوردن

ئيـــســـتـــەش به تەمـاعی مـــالی كـــوردن

هەر رۆژه له دەوری مــــــەرقــــــەديكی

بۆيان گــــر دەبێ بـه قـــــەد له كـــێكی

هەر كــــوردی فــــەقــــيــــری خــــانه وێران

نه قـــــەبری هەيه نه بيـــــر نه زيندان

---

٧٠- مەبەستی ئينگليزه.

٧١- سەهرەوەردی: مەبەستی له عومەر سەهرەوەردی شێخی تەصووف و زانای شافيعييه له سالآنی (١١٥٣- ١١٩١)ز ژياوه و پێی گوتراوه شێخی شێخەكانی بەغدا ئێستاش گۆڕەكەی له بەغدا ماوه و سەردانی دەكرێ.

ئەو نەوتەیە مـــــایەی حـــــەیاتی
ئەو نـەوتـەیـە ســــــــەروەتـی وولاتـی
مـــەحـــرومـــە لە حـــاســـلاتی ئەرزی
بێـــــچـــــارە ئەوا دەخــــــواو دەلەرزی
قـــەتعی نەزەریش لە مـــەعـــدەن و کـــان
ئەم ئاوو بەراوی مـــــوڵکی کـــــوردان
کــــــــردیان بە ئەرازی ئەمـــــیـــــری
وەی خـــاک بەســـەرت تۆش ئەســـیـــری
هەر وەخـــــتـــــە لە داخی ئێـــوە بمرم
ڕۆیـیـــــوە قـــــەرارو هۆش و ســــەبرم
چ بکەم چ بڵـــــێم لە تاوی کـــــوردان
ئـاگـــــــــر دەگـــــــری دڵم لـە دەردان
چارەی چیـــــە خـــــوایە تۆ دەزانی
خـــۆت عـــالمی زاهیـــر و نیـــهـــانی
ئەو زوڵمـــــە قـــەبول نەکـــەی خـــودایە
ئەســـڵـــەن ئەمـــەلم بە کـــەس نەمـــایە
لـوتـفـی تـووە مــــــەلجـــــــەئو پەنـاهم
ڕەحـــمـــێکی بە کـــورد بکەی ئیـــلاهم
وەک دێـتـــــە دڵم خـــــەیاڵی نەوتێ
هەنـدە نـامـــــێنێ جـــەرگم بســــوتێ
قـــەومێ کـــە فـــەقـــیـــرو نا تەوان بێ
قـــــــەومێ کـــــە زەلیـل و بێ زوبان بێ
ئەلبـــــەتە خـــــراپـتــــری بەســـــەر دێ
جـــێـی ناکـــــەنەوە لە شـــــارو لادێ

وەک بزنی گــــــڕو دەبێ دەری کـــــەن
نابێ تخــــونی بێـــــرو مــــەڕی کـــەن
تا ئێـــــوە لە حـــــەق ئێکدی خـــرابن
بەد خـــــواهو حـــەســــوودو نا تەبابن
تا ئێـــــوە لە هەق ئێکدی بە کــــەیدەن
هەر ژێر چەپەڵۆکی عـــــەمـــــرو زەیدەن

لە ساڵی ١٩٣٠ ئەم شیعرەی داناوە:

